# نــزا

دکتۆر عەلی شەریعەتی

وەرگێڕانی لە فارسییەوە
موسعەب ئەدهەم



هەولێر – ٢٠١٤

خانەی موکریانی بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە

● نـــــــزا

● نووسینی: ئەلێکسس کارل - دکتۆر عەلی شەریعەتی

● وەرگێڕانی لە فارسییەوە: موسعەب ئەدهەم

● نەخشەسازی ناوەوە و بەرگ: ڕێمان عەبدولجەبار

● پێداچوونەوەی: ڕێبوار کوردستانی

● نرخ: (٢٠٠٠) دینار

● چاپی یەکەم : ٢٠١٤

● تیراژ: ١٠٠٠

● چاپخانە: موکریانی(هەولێر)

● لە بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی کتێبخانە گشتییەکان ژمارەی سپاردنی (٣٠) ساڵی (٢٠١٤)ـی پێ دراوە.



زنجیرەی کتێب (٨٠٦)

ماڵپەڕ: www.mukiryani.com

ئیمەیل: info@mukiryani.com

# پێرست

## بەرایی:

بابەتی "نزا" یەکێکە لـە بابەتـە گـرنگ و لـە هەمانکاتـدا پڕچـێژەکانی ئایینـەکان و دونیای عیرفان و مەعنەوییەت، چەمکێك کە گەلێ قسـەی لـەبارەوە کـراوە و زۆری لەسـەر نووسراوە و وتراوە. دیارە "نزا" و پاڕانەوەی هەر مرۆڤێك لە مرۆڤێکـی تـر جیـاوازە، ئـاخر جیهانی هەریەکەمان لەوی دیکەمان جیاوازە، بابەتی "نزا"ش لەو بابەتانەیە کە پەیوەندییان بە جیهانە ناوەکی و رۆحیەکەی ئێمەوە هەیە، بۆیە دەشێ بلێین بە هێندەی مرۆڤەکان، "نزا" و پاڕانەوەی جیا و جۆراوجۆریشمان هەیە. ئیـدی لێـرەوە "نـزا" جـوان و ناسـك و جوداکـان نومایان دەبن.

دەوترێ گەر بتەوێ مرۆڤێك بناسیت، یەکێك لە رێگاکانی ئەم ناسینە بریتیە لە "نـزا"، ئەو کەسە چی داوا دەکات و چ شت گەلێك دەخوازێت، بۆیە لە رێگەی جۆری "نزا"کانیشەوە دەکارێ روانینی مرۆڤەکان و ئاستی تێگەیشتنی مرۆڤەکانیش بناسینەوە.

ئەم کتێبەی بەردەستت زنجیرەی ژمـارە (٤) لـە زنجـیرەی کتێبـەکانی بیرمەنـدی دیـار و ناسراو خوالێخۆشبوو "د.عەلی شەریعەتی"، دوای زنجیرەی یەکەم و دووەم کە وەرمانگێڕان و برای ئازیزیزیشم "کاك حوسێن" "فەرهەنگی زاراوەکانی" وەرگێڕا، بەم ناونیشانانە بوون:

١. دەفتەرە خۆڵەمێشیەکان (لەبارەی ئیمان و هەست و ئەندێشە)ەوە.
٢. "مرۆڤ"، کـە بەمزوانـە چـاپی سـێیەمی بڵاودەبێتـەوە و سـوپاس بـۆ خـوا تـاکو رادەیەکی گەلێ باش جێگەی رەزامەنـدی خوێنـەرانی ئـازیز بـووە. بـەو ئومێـدەی بتوانین کار لەسەر بەرهەمەکانی تریشی بکەین و زێدەتر رۆحی مـەزنی ئـەم پیـاوە مەزن و جوانە بە خوێنەری کورد ئاشنا بکەین، جوانی نزاکان و ناسـکی و روانینـی "د.شەریعەتی" یش بۆ "نزا" و "پاڕانەوە"کانی بۆ خوێنەری ئازیز جێ دەهێڵین.

ئەوەی لە کۆتاییدا ماوەتەوە ئاماژەی پێ بکەین بریتییە لەوەی بەو پێیەی بەندە (٧)ساڵ لەمەوبـەر لـە پێشـانگای کتێبـی نێودەوڵـەتی "تـاران" لەگـەڵ بـرا و هـاوڕێم "کـاك حسێن"چاومان بە خێزانی "دکتۆری خوالێخۆشـبوو" کـەوت، بەداخـەوە هەرچـەندە مـاوەی

کـەمبوو، بـەلاَم گرنگـی چـاوپێکەوتنەکە لـەوەدا بـوو کـە باسـی نووسـین و بلاَوکردنـەوەی بەرهەمـەکانی "دکتـۆری خوالێخۆشـبوو"مان کـرد و ئـەوانیش پێیـان بـاش بـوو، تـەنها مەرجێکیان پاراستنی ئەمانەت و گواستنەوەی ووشە و نووسینەکانی بوو، هەڵبەتە ئـەوکات بەندە هیچ کتێبێکیم بۆ زمانی شیرینی کوردی وەرنەگێڕابوو. بۆیە بـە پێویسـتم زانـی وەکـو پاراستنی ئەمانەتێك ئەوە رابگەیێنم ئەم کتێبەی لە بنەڕەتدا (٤)چوار بەشـە و بەنـدە تـەنها (٢)بەشم وەرگێڕاوە و لەبەشی "نزا"کانیشـدا نزاکـانم هـەموو وەرنـەگێڕاوە، بـەو ئومێـدەی نووسەران و وەرگێڕانـی دیکـەشمان بتـوانن لـەم رووەوە هەوڵـەکانیان زێـدەتر بخەنەگـەڕ و بـە هەموومانەوە خزمەتێك بە رۆحی خۆمان و رۆحی کۆمەڵگەی کوردیشمان بکەین.

بە پێویستی دەزانم سوپاسی هاوڕێی ئازیزم "کاك زیرەك" بکـەم، گـەر هـەوڵ و ئـەرکی ئەوان نەبوایە – کە خۆشیان نامیلکەیـەکی "د.شـەریعەتی"یان وەرگێـڕاوە، ئـەم بەرهەمـە بەمزوانە نەدەهاتە بەرهەم، لێرەوە گەلێك سوپاسی دەکەم.

دواجار داوای لێخۆشبوون لە خودا و لێبوردن لە خوێنەری ئازیز دەکەم لـە هـەر هەڵـە و تێنەگەیشتنێك کە بە تێبینی و هاندانەکانیان بەردەوام دڵگەرم و دڵخۆشمان دەکەن.

**موسعەب ئەدهەم – سلێمانی**

# دەفتەری یەکەم

# نـــــزا

ئەلێکسس کارل

وەرگێڕانی بۆ فارسی:

دکتۆر عەلی شەریعەتی

# نـــزا

## یاداشتی وەرگێڕ:

کتێبی بەردەستت چەند ساڵێك لەمەوبەر لە لایـەن دۆسـتی بیرمەنـد و بـەڕێزم جـەنابی "ئەندازیار ئەحمـەد زادە" بـۆ فارسـی وەرگێـڕدرا بـوو. سـاڵی رابـردوو کـە بـۆم دەرکـەوت وەرگێڕادراو داوام لێکردن کە رێگە بدەن لە لایەن ئەنجوومەنی ئیسلامی فێرخوازانی مەشهەد بڵاوبکرێتەوە. بەڵام لەبەرئەوە دەقەکەی لە روداوێکدا لەناو چوو بوو، لەو روەوەی کە توانـای بەراوردکردنی وردی وەرگێڕانەکە بەهۆی نەبوونی کتێبەکە لە ئێراندا نەبوو، لە چاپکردنەوەیدا وا پێنەدەچوو زۆر رازی بن، بەڵام بە پێچەوانەی ئەوانەوە، من موشتاقی چاپکردنەوەی بووم و هەر بەهەمان شێوە بە شتێکی بەسـوودم دەزانـی. (بەداخـەوە هـەر بـەو جـۆرەی دواتـریش ئاماژەی پێکراوە، تەنانەت ئەم وەرگێڕانەش لە گرفتاریەکدا کە هاتە پێشەوە، ون بوو.)، لـەم روەوە بڕیامدا بە زیادکردنی پێشەکییەك و راڤەی حاڵی وردی دانەر و پەراوێزی پێویسـت بـۆ بڵاوکردنەوە ئامادە بکەم.

لەو کاتـەدا ئـەم بیرکردنەوەیـە هاتـە پێشـەوە کـە دانـەری کتێبەکـە تـەنها لـە چـاوی بیرمەندێکی مەسیحییەوە سەیری بابەتی نزا و پاڕانەوەی کردوە و هۆکاری بوونی ئەم بابەتـە و ئەو بەرهەمەی لەسەری بونیاد نراوە هەر بەو جۆرەی لە مەسیحیەتدا بـوونی هەیـە باسـی کردوە و شیکردنەوەی ئەنجامداوە.

ئەگەرچی لە ئیسلامیشدا نزا خاوەنی فەلسەفەیەکی لەجۆرە و بەرهەمی لەجۆرەیە، بـەڵام ئەو خاڵەی کـە لـە دوو تـوێی خوێندنـەوە و بـەراوردکردنی دەقـەکانی نزاکـان و چـۆنییەتی بەجێهێنانی هەندێکیان کە لە ئیسلام و مەسیحییەتدا بوونیان هەیە، لە پێشتر بوونێك هەیـە

که نزا و دوعای ئیسـلام بەسـەر مەسـیحییەتدا هەیـەتی و ئـەویش ئەوەیـە کـە دوعـا لـە ئیسلامدا جگە لە لایەنی عیرفانی، خاوەنی لایەنی کۆمەڵایەتی و و تەنانەت سیاسیشە.

بە تایبـەت لـە دەقـەکانی نزاکـانی مەزهـەبی "شـیعە" ئـەم حاڵەتـە روونـتر و تیـژتر بەرچاومان دەکەوێت و هەندێجار ئەوە هەیە کە هەنـدێك لـە رسـتەکانی رەنگـی دروشمێکـی حیزبی و سیاسی بە خۆوە دەگرن.

دوعـای مەسیحیەت لە دەوری ژیان و کێشمەکێشمەکانیدا دەسوڕێتەوە و هەر بەو جۆرەی "کارل" دەڵێت: بنەڕەتی هەژاری و عیشقە. بەڵام لە ئیسلامدا توخمێکی تری بۆ زیاد دەبێـت و ئەویش دەربڕینی ئازارەکان و ویست و داخوازیە کۆمەڵایەتی — گروپییە کە کەسـی نزاکـەر پێیانەوە وابەستەیە.

هاتنە ناوەوەی توخمی سیاسەت لە بابەتی نزا ئیسـلامییەکاندا بەلەبەرچـاوگرتنی ئـەوەی بیرۆکە کۆمەڵایەتییەکان، هەمیشە لە باشترین فرسـەتە گونجاوەکانـدا بـەو کەسـەی کـە نـزا دەکات و دەپارێتەوە دەردەبرێت و دەبەخشێت، دەبێتـە هـۆی ئـەوەی ئـەم ئایـدیا و بیرۆکـە پیرۆزانە بە شـێوەیەکی جـێگیر و هاوبەشـی نێـوان مرۆڤـەکان کـە لـەم رێگەیـەدا هـەنگاو هەڵدەگرن، بڵاوببێتەوە.

لەوەی کە رابورد کاتێك ئایدیا کۆمەڵایەتییەکان لە پـەنای نزاکانـدا دەبـن لـە گەسـتنی قەیرانە سیاسیەکان و رۆژگاری تێکچووی کۆمەڵگە دەپارێزرێن و هەمیشە تایبەتمەندی ژیـان و جووڵە لەگەڵ خۆیاندا دەپارێزن.

بە خوێندنەوەی دەقە جیـاواز و جۆراوجۆرەکـانی نـزا ئیسـلامییەکان، دەتوانرێـت ئەمـە هەڵبگۆزرێت کە نزای ئیسلامی - هەڵبەتـە ئـەو دەقانـەی لـە رووی سـەنەدی مێژوویـیـەوە رەسەنێتیان هەیە- لەم توخمانە پێکهاتووە و دروستبووە:

١. **ڕەوانبێژی.**
٢. مۆسیقای کاریگەر و گونجاو لەگەڵ ناوەڕۆکی نزاکەدا (سەجع و هاوسەنگی، ماوە و دووری، نەرمی و زبری، جناس و ...هتد.)
٣. **عەقڵ:** تەرحکردنی بابەتگەلی فیکری و فەلسەفی بۆ ئاراستەکردنی عەقڵ و جولاندنی هێزی بیرکردنەوە بە هەماهەنگی و سازشکردن لەگەڵ حاڵەتی نزا و پاڕانەوە لە ڕێگەی ڕوونکردنەوە و دەربڕینی دەرکەوتە و ڕوخساری دەسەڵات، موعجیزاتی بەدیهێنان، جوانی و هونەرمەندیە بێشومارەکانی بەدیهێنەر.
٤. **سیاسەت:** لێرەدا بە مانای تەرحکردنی بابەتە کۆمەڵایەتییەکان و ڕوونکردنەوەی کێشمەکێشمەکانی نێوان حەق و ناحەق، چاکسازی و گەندەڵی، خۆشبەختی و بەدبەختی خەڵك و تەڵقینکردنی شەهامەت و نەفرەت دژی تاك یان کۆمەڵی ستەمکار و خەیانەتکار و ڕاگەیاندنی وەفاداری بەرامبەر ستەملێکراو و بەرامبەر بە هەق و ئازادی و خۆشبەختی خەڵك و لەبەرامبەر خودادا.
٥. **خۆبەدەستەوەدان و سەرکەشی:** نزا ئیسلامییەکان هەوڵدەدەن تاکو ئەو مرۆڤەی نزا دەکات، لەبەرامبەر خودادا تەسیلم بوون خۆبەدەستەوەدان و خۆبەکەمزانین سەری خۆی دابنەوێنێت، بەڵام ئەم هەوڵدانە بە جۆرێك ڕوودەدات کە لە هەمان کاتدا ئەوە بە مرۆڤ دەڵێت کە هیچ دەسەڵاتێکی تر، حکومەتێکی تر و خاڵی ئومێد و پشت بەستنێکی تر جگە لە ئەو بە فەرمی نەناسێت. بە دەستەواژەیەکی تر ئەم خۆبەدەستەوەدانە لە بەرامبەر خودادا جۆرێك ئەنجام دەدرێت کە ترس و بیمی لە هەر هێزێکی تر لە بیر دەباتەوە و ناهێڵێت.
٦. **سەرکەوتن:** کەسی نزاکەر هەمیشە داوا لە خودا دەکات مەرجی دەروونی و هۆکار و ئامرازی دەرەکی جۆرێك فەراهەم بن کە ئەو بتوانێت دەست بکات بە کۆشش و هەوڵدان لە ڕێگەی تەواوکار "کمال"، چاکە و خێردا و بەو جۆرەی خودا دەیەوێت سوودیان لێوەربگرێت.

بابەتی سەرکەوتن لە هەمانکاتدا بۆ رەسەنێتی توانای ئیرادەی مرۆڤ دەگەڕێتـەوە دەبێتـە هـۆی ئـەوەی دیـاردەی خۆبەشـت زایـن و خـۆبینین کـە هۆکـاری توندتیـژی رۆح و کـورتی ئەندێشەیە، مرۆڤ داگیر نەکات.

٧. **تـەفویچ:** کاردانـەوەی ئـەو مرۆڤەیـە کـە لـە دونیـای چـێژ و ئـازار، هـەژاری و دەوڵەمەندی و خۆشی و ناخۆشی خـۆی زیـاتر رۆیشـتووە و بەرژەوەنـدی خـۆی لـە بەرژەوەندی گشت و سیستەمی گشتی بەدیهێنان تواندۆتەوە، بێجگە لەوەی پەی بە بێ تواناییی خۆی بردووە و ئـەوەی لەبەرژەوەنـدی خێـر و چـاکەی خۆیـەتی دیـاری ناکات. لێرەدایە کە مرۆڤ تاکو قۆناغی گومان و حیرەتی باڵا و پیرۆز سـەرکەوتووە، چارەیەکی دیکەی نییە جگە لەوەی کاری خۆی بداتە پاڵ ئەو لە بەرامبەر ویسـت و دیاریکردنی ئەو خۆ بەدەستەوە بدات و رازی بێت بەوەی کە ئەو بیەوێت.

٨. **هەژاری فەلسەفی:** یان بەهۆی لاوازی من، یان لاوازی زمان، توانای ئـەوەم نـەبوو زاراوەیەکی گشتگیرتر و فـراوانتر لەمـە بدۆزمـەوە. لەبەرئـەوە ناچـارم ئـەوە روون بکەمەوە هەر بەو جۆرەی "کارل" دەڵێت: بنەڕەتی نزا لەسەر دوو بنەما وەسـتاوە، ئەوانیش بریتیە لە هەژاری و عیشق.

یان کەسی نزاکەر ئەو کەسەیە لە داوا لە خودا قەرزێکی جێبەجێ ببێـت، نەخۆشـیەکەی چـاك ببێتـەوە، موسـافیرکەی لـە سـەفەرەوە بـە سـەلامەتی بگەڕێتـەوە و یـان لـە کـاتی بەرزکردنەوەی پلەکان بە هەڵە دوو پلەی بە جارێك بۆ دەربچن! ئەم جـۆرە نزایانـە زیـاتر لـە نێوان مرۆڤە گشتی و خەڵك گشتیەکەدا بوونیان هەیە.

یان کەسی نزاکەی مرۆڤێکی باڵا و کەسێکە خودا عاشـیقانە دەپەرسـتێت، لـە گفتوگـۆ لەگەڵ ئەودا، لە وەستان لەبەرامبەریدا، چێژ وەردەگرێت.

جۆری یەکەم تا رادەیـەك تایبەتـە بـە خەڵکـە گشـتیەکەوە و جـۆری دووەم رێگەیـەکی تایبەتی عیرفانییە.

بەڵام هەندێجار نزا بە شێوەیەکی تر دەردەکەوێت، لێرەدا نزا قۆناغەکەی لە هەژاری بەرزتر و لە عیشق جدیتر دەبێت.

لێرەدا ئەو مرۆڤەی نزا دەکات بەوپەڕی توندوتۆڵی و تواناوە داوا لە خودا دەکات.

لێرەدا مرۆڤێك داوا دەکات کە بیر لە هەژار و دەوڵەمەندی، نەخۆشی و تەندروستی ناکاتەوە. ئەو هەست بە نیاز و پێداویستی تر دەکات، هەست بەوە دەکات مومکینە لە زنجیرەی تەواوکار"تکامل" دوا بکەوێت، شایستەبوونی مانەوە و نەمری لە دەست بدات، رۆحی تاکو بەرزترین لوتکە کە چارەنووس بۆ بوونەوەری مرۆیی داناوە بەرز نەبێتەوە و نەڕوات. پێی لەم رێگوزەرەدا کە بە سەری مەنزڵی مەبەست دەگات، سستی بکات و لە نیوەی رێگەدا لەسەر لێوی بەحری فەنا گیان بە حەسرەت بسپێرێت.

لەم حاڵەتەدایە کە مرۆڤ لە بەرامبەر خودای ئیسلام نزا دەکات و دەپاڕێتەوە، هەستکردن بە نیاز، عیشق و ترس بە توندی دایدەگرێت.

خودای ئیسلام تەنها باوکی میهرەبان و مەعشوقی نەرم و دەستەمۆی مرۆڤ نییە، ئەو لە هەمانکاتدا خاوەنی جەبەرووت، قەهر و توڕەبوونە.

ئەندێشە گەورەکان، نیازی گەورەتر و ئازاراویتریان هەیە.

هەستی دواکەوتن لە تەواوکاری "کمال"، دوورکەوتنەوە لە دراوسێیەتی دۆست، لە مانەوەی ئەبەدی، لە ژیانی نەمری و مەحروومبوون لە چاکسازی و جوانی و خێر رەها و دواکەوتن لەو گروپەی توانیویانە تاکو ئەو جێگەیەی بە خوداوە پەیوەست بن درێژە بە رێگە بدەن و لە ونبوون و لە ناوچوون لە گەرد و غوباری ئەو کاروانەی بە خێرایی تێدەپەڕێت تاکو خۆی بەو جێگەیە بگەیێنێت، ترسێکی لەمجۆرە لە دڵی ئەو مرۆڤەی سەرووتر لەوانیتر بیر دەکاتەوە، بەرپا دەکات کە بۆ ئەوانیتر جێگەی دەرککردن نییە.

باڵاترین نموونەی ئەم جۆرە نزایە لە قسەکانی "عەلی" خودای لێ رازی بێت، لەگەڵ خودای ئیسلام دەتوانرێت بدۆزرێنەوە و بەم پێوەرەشە دەتوانرێت باشتر لە ترسەکان و لە هۆش خۆچوونەکانی تێبگەین.

توێژینەوەی ئەم جۆرە بابەتانە لە حەوزە زانستیە ئیسلامییەکاندا دەبێت بە ڕێگەی زانستی و لۆژیکی دەست پێ بکەین.

لە ئێراندا من ماوەیەك لەم زەمینەیەدا کارم کرد و بەرهەمی ئەو کارەی کە بڕیار بوو لەگەڵ پاشکۆی ئەم کتێبەدا بڵاوبکرێتەوە، بە داخەوە لە دەستچوو و هەموو ئەو یاداشت و خوێندنەوە لێکۆڵینەوانەی کۆم کردبوونەوە لەگەڵ وەرگێڕانی کتێبەکەدا لە گرفتاریەکدا کە بۆم دروست بوو، لە دەستم دان. ئێستا کە لێرەدا دەقی ئەم کتێبەم دەستکەوتووە، لەبەرئەوە نە بوار و نە سەرچاوەی پێویستم هەیە بۆ ووردبینی لەم بابەتەدا، وەرگێڕانی سادەی کتێبەکە پێشکەشی یاران و هاوبیرانی خۆم دەکەم و لێکۆڵینەوەی لۆژیکی فراوان لەبارەی بابەتی نزا و بەتایبەت نزای ئیسلامی بۆ کەسانێك جێدەهێڵم کە هەم بواری و سەرچاوەی زیاتریان هەیە و هەم شایستەیی زیاتر.

**هاوینی ١٣٣٨- پاریس**

**عەلی شەریعەتی**

# بەناوی خودا

لە مانگی (١٢)ی ساڵی (١٩٤٠) نووسەری ئەم دێڕانە وتارێکی لەبارەی "هێـزی نـزا"ەوە لـە گۆڤـاری گـەورەی ئـەمریکی "ریـدرز دایگسـت"، (Readers Digest) بـە زمـانی ئینگلیزی نووسی.

ئەم وتارە لە سەرەتای ساڵی (١٩٤١)دا پاش کورتکردنەوە و چاککردنی بە هۆی یەکێك لـە وەشاندنەکانی بڵاوکردنەوەی کتێبەوە بڵاوکرایەوە.

پاش ئەوە گوایا بۆ فەرەنسی وەرگێڕداروە و لە "ژورنال دوژنو" بڵاوبۆتەوە. پاش ماوەیـەکی کەم گۆڤارێکی هەفتانەی مەزهەبی دووبارە و جارێکی تر لە فەرەنسـادا بـڵاوی کـردەوە و لـەم کاتەدا بوو کە نووسەر پەی بە پێنەگەیشتوویی ئەم وەرگێڕانە برد و پەسەندی نەکرد و لـەم روەوە لە سەرەتای ساڵی (١٩٤٤)دا بڕیاریدا جارێکی تر لێکۆڵینـەوە و توێژینـەوە لـە بابـەتی نـزا و پاڕانەوەدا بکات. نووسەر نە عاریفە و نە فەیلەسوف، ئەو ئەوەی لە دڵدایە بە زمـانی سـادە و ئاسایی دەری دەبڕێت و باسی دەکات و ووشەکان لـە مانـای جیـاواز و هەنـدێجار بـە شـێوەی زاراوەیەکی زانستی بەکاردەهێنێت. ئەم لێکۆڵینەوەیە لەبارەی نـزاوە گوشـراوی خوێندنـەوەی و توێژینەوەی بێشومارەکە لە درێژایی ژیانێکی درێژدا لەسـەر چـین و توێـژی جۆراوجـۆر بەرهـەم هاتووە. رۆژئاواییەکان و رۆژهەڵاتیەکان، خەڵکی نەخۆش و تەندروست، کەشیشـانی کاسـۆلیك، ژنان و پیاوانی ئاییندار لە هەر چین و توێژێك، کەشیشانی پرۆتستان لە هـەر پلـە و پۆسـتێکدا، حاخامەکان، پزیشکان و ژنانی پەرستار، پیاوان و ژنان لە هەر کـار و ئـیش و لـە هـەر توێـژ و کۆمەڵێکـدا. لەسـەرووی ئەمەشـەوە، لێکۆڵینـەوە نەشـتەرگەری، فیسـۆلۆژی و توێژینـەوە و ئەزموونی تاقیگـە لـەبارەی زینـدەوەرە ووردەکـان و چـاککردنەوەی نەشـتەرگەرییەکان — کـە

ڕۆژگارێکە پێیانەوە سەرگەرمە- ڕێگەی ئەوەی پێداوە کە هەندێك کاریگەری دەرمانی نـزا بـە هەند وەربگرێت و بە گرنگیان بزانێت.

ئەو تەنها لەبارەی ئەو بابەتانەوە قسە دەکات کە یان خۆی لێکۆڵینەوەی لـەبارەوە کـردوون یاخود لەو پیاوانەی کە شایستەیی لێکۆڵینەوەی وورد و ئازادانەیان هەبووە، وەرگرتووە.

پێش هەر شتێك هەوڵدەدات تاکو لە شوێنگەی حەقیقەتدا بەهێز بمێنێتەوە. لە هـەنگاوی یەکەمدا ئەم بیرۆکە دێتە پێشەوە کـە ڕوانینێکـی نـوێ لەمـەڕ نـزا، قسـەکردن بـە تـەواوی بێسوودە، لەگەڵ ئەوەشدا ئایا پێویسـت نییـە کـە ئێمـە هـەموو هەوڵـەکانمان کـە دەتـوانین ئەنجامیان بدەین، دیارییان بکـەین؟ چـونکە ئێمـە نـاتوانین هـیچ یـەکێك لـەم هەوڵانـە واز لێبهێـنین بـە بـێ ئـەوەی مەترسـییەکی زۆر گـەورە بـۆ خۆمـان یـان وەچـەی داهاتوومـان هەڵنەگرتبێت. لاوازی هەستی عیرفانی و هەستی ئەخلاقی بە ئەندازەی لاوازی هێزی دەمـاغ زیانهێنەرە.

ئەم ئەو ڕێگاگەلەن کە خراونەتە بەردەم ڕێگەی هەمووانەوە، چ ئەوانەی ئیمانیان هەیـە و چ ئەوانەی نیانە. دواجار بۆ ئەوەی ژیان بە سـەرکەوتن کۆتـایی پـێ بێـت، جۆرێـك ئـەرکی جەبری بەسەر هەمووندا دەدات، ئەو دەیەوێت ئێمە لە رووی پێکهاتەی جەستەیی و دروونـی خۆمان، پەیڕەوی لە هێڵێکی ڕێك و پێویست و بەڵگەنەویست بکەین و ئەمەش لەو ڕووەوەیـە کە نابێت هیچ کەس لە قوڵترین و جوانترین نیازە فیتری و سروشتییە مرۆییەکان بێئاگا بێت.

## ● نــــزا:

لە بۆچوونی ئێمەی رۆژئاواییدا، جەنابی عەقڵ پلەیەکی باڵاترە لە عیشق. ئێمە هەبوونی هێزی دەماغ بەسەر هێزی کەشفکردن و هەستدا دەدەین و بە لـە پێشـتری دەزانـین. زانسـت دەدرەوشێتەوە لە کاتێکدا مەزهەب بێـدەنگ و بێدەنگیـە. ئێمـە پـەیڕەوی لـە "دیکـارت" دەکەین، بەڵام وازمان لە "باسکاڵ" هێناوە. ئێمە بە جۆرێـك لـە فراوانبـوون و بـەهێزبوونی هێزی مێشکمان هەوڵدەدەین، بەڵام کۆششە مەعنەوییەکانی رۆح — وەکو هەستی ئـەخلاقی، هەستی جوانی و بە تایبەت هەستی عیرفانی- لە تەواوکاری وەستاون.

لاوازی ئەم غەریزە قوڵانە، روانینی و نیگای مرۆڤی نوێیان کوێر کـردوە. کەموکورِیـەکی لەمجۆرە ئەو مەیدان و بوارەی پێنادات بۆ پێکهاتەی بینای کۆمەڵایەتی بتوانێت بە تـوخمێکی شایستە بژمێردرێت.

ئەمە حاڵەتێکی زۆر ناپەسەندە کە لە شارستانییەتی ئێمەدا دەبێت ریشەکێش بکرێت.

بـە هـەرحاڵ مەعنەوییـەت لـە بابـەتی دەگمـەنی و سـەرکەوتن لـە ژیانـدا هاوئاسـتی بیرکردنەوە و عەقڵگەرایی کاریگەر خۆی پیشان دەدات.

زۆر پێویستە کە ئەو هێزە مەعنەویانە —کە یەك لە دوای یەك زیاتر لە هێزی دەماغ لـە بەهێزکردن و تەواوکاری کەسایەتی و فیترەت کاریگەرە- جارێکی تر زیندوو بکەینـەوە و بـە جوانی دەریان بخەین.

لە نێوان ئەم هێزە مەعنەویانەدا، لە هەموویان زیاتر لەسەر رووی هەستی عیرفـانی یـان هەستی مەزهەبی گەردی فەرامۆشی نیشتووە.

هەسـتی عیرفـانی زۆرجـار لـە نـزادا دەردەکـەوێت. نـزا لـە کۆتاییـدا روونبوونـەوەیی دیاردەیەکی رۆحیە. لە کاتێکدا کە جیهانی رۆح لـە دەرەوەی دەستڕاگەیشـتنی زانسـتەکان و هونەرە ماددییەکانمانە، کەواتە چۆن دەتوانرێت لـەبارەی نـزاوە ناسـینی تـەواو و ئـەزموونی بەدەست بهێنین؟

خۆشبەختانە قەڵەمڕەوی زانست تاکو دامێنی هـەموو شـتە بەرهەسـتەکان رۆیشـتووە و دەتوانرێت بە هۆی کارئەندام زانی "فسیۆلۆژی"یەوە، دەرکەوتەکانی رۆحیش لە بەشێکی ئەم

قەڵەمڕەوەدا بهێنین. لەبەرئەوە لە ڕێگەی توێژینـەوەی لـۆژیکی ئـەو مرۆڤـەی نـزا دەکـات، دەتوانین ئەوەمان بـۆ دەربکـەوێت کـە دیـاردەی نـزا لەسـەر چ بنەمایـەك وەسـتاوە، لـە چ ڕێگەیەکەوە بە بەرهەم دەگات و بەرهەمدار دەبێت و بەرهەمەکانی کامانەن؟

وا پێدەچێت نزا لە بنەڕەتدا کۆششی ڕۆحە بەرەو بازنەی نامـاددی جیهـان. بـە شـێوەیەکی گشتی نزا بریتیە لە ناڵە و زاری کردن، ناڵەی دوودڵیانە و دڕۆدۆنگانە و داواکردنـی یارمـەتی و دەستگرتن و هەندێجار حاڵەتێکی کەشفکردن و بینینێکی ڕۆشن و ئارامی دەروونی و بـەردەوام و دوورتر لە هەرێمی هەموو شتە بەرهەستەکان. بە دەستەواژەیەکی تر، دەتوانرێت بوترێـت نـزا فڕینی ڕۆحە بەرەو خـودا یـان حاڵـەتی پەرسـتنی عاشـیقانەیە لەبەرامبـەر ئـەو بـاوەڕەی کـە پــەرجووی ژیــان لــەوەوە ســەری دەرهێنــاوە و دواجــار نــزا پیشــاندەری کۆششــی مرۆڤــە بــۆ پەیوەستبوون بەو بوونە نەبینراوە، بەدیهێنەری هـەموو بـوون، عـەقڵی گشـتی "کـل"، هێـز و دەسەڵاتی ڕەها، خێر و چاکەی ڕەها "خیر مگلق"، باوك، (نووسەر ووشەی باوکی بەکارهێناوە، چونکە مەسیحیە)، ڕزگارکەری هەریەك لە ئێمە. بەدەر لەوەی وتراوە، حەقیقەتی نزا حاڵـەتێکی عیرفانی پڕ لە توانەوە بەرجەستە دەکات کە تیایدا دڵ بەرەو خودا ڕادەکێشرێت.

ئەم حاڵەتە لە سروشتی عەقڵـەوە سەرچـاوە ناگرێـت و هـەر لـەم ڕووەوەیـە کـە تـاکو ئـەو جێگەیەی دەرك ناکرێت، لە بۆچوون و ڕوانگەی ئەهلی فەلسەفە و بەڵگەهێنانـەوە "اسـتدلال"، شتێکی جێگەی قبوڵکردن نییە.

هەر بەو جۆرەی کە داستانی جوانی و عیشـق لـە دەفتـەردا نییـە و پێویسـتی بـە وانـە و فێرکردن نییە، ئەوانەی دڵی خاڵی یان لە ئەندێشە هەیە، خودا هەروەك گەرمای خۆر یـان عـەتر و بۆنی گوڵ بە شێوەیەکی سروشتی هەست پێدەکەن. بەڵام هەر ئەو خودایەی کە بەمجۆرە لەگـەڵ کەسێك کە "خۆشویستن" دەزانێت بە ئاسانی دەردەکەوێت و بـوونی دەبێـت، خـۆی لـە چـاوی ئەوەی کە "جگە لە تێگەیشتن" شتێکی تر نازانێت، پەنهان دەکات.

ئەندێشە و دەربڕین و ڕوونکردنەوە لەو جێگەیەی پێی نزا دێتە ناوەوە، دەمێنێتەوە، چـونکە نزا باڵاترین لوتکەی دەستەواژە لە فڕینی عیشق، لە نێو شەوی تاریکی عەقڵ پەیدا دەکات.

## ● دەبێت چۆن نزا بکرێت؟

ئێمە هونەری نزا لە زمانی "سن پاولّ" تاکو "سن بینوت"، لە زاهیدەکانی مەسیحیەت و ئەو کۆمەڵە بانگخوازە ون ناوەی کە ماوەی (٢٠) سەدە گەلانی رۆژئاواییان ئاشنای ژیانی مەزهەبی کردوە، فێر بووین. خودای "ئەفلاتۆن" لەو لوتکەی مەزنایەتییەدا نەدەتوانرا دەرك بکرێت. خودای "ئەپیکتیت"، (فەیلەسوفی رەواقی سەدەی یەکەمی زایینی لە رۆم)، لەگەڵ رۆحی شتەکاندا هەڵە دەبوو. یەهود سولّتانێکی ستەمکاری رۆژهەڵاتی بوو کە ترسی دەخستە ناو دڵەکانەوە نەك عیشق. بەڵام مەسیحیەت بە پێچەوانەوە خودای خستۆتە بەردەم تێگەیشتنی مرۆڤەوە، ئەو وێنەی بە خودا بەخشیوە و لە باوکمان، برا و رزگارکەری بۆمان دروستکردوە. (ئەم گوتانە نووسینی "ئەلیکسس کارل"ن، ئێمە وەکو خۆی وەرمانگێڕان.و. کوردی).

بۆ گەیشتن بە خودا پێویست بە ئەنجامدانی شتانی ئاڵۆز و لەخۆبواردن و وازهێنان لە خود و خوێن ناکات، نزا ئاسان و رێگەکەشی ئاسانە.

بۆ نزا تەنها دەبێت هەوڵبدرێت تاکو بەرەو خودا بڕۆیت و رابکێشرێیت. ئەم کۆشش و هەوڵدانە دەبێت بە دڵ بێت نەك بە دەماغ. بۆ نموونە: قوڵبوونەوە لە گەورەیی و مەزنی خودا بە نزا ئەژمار ناکرێت، مەگەر ئەوەی کە ئەم قوڵبوونەوەیە لە هەمانکاتدا هاوڕای گوشراوێك لە عیشق و ئیمان بێت. بەم رێگەیە نزا بە پێی شێوەی "لاسال"، (موبەشری مەزهەبی مەسیح) لەگەڵ رێنوێنییەکی عەقڵیدا بە جۆرێك دەست پێ بکات کە بتوانێت بە حاڵەتێکی ئیشراقی و رۆحی بگات.

نزا هەرچی بێت، درێژ یان کورت، دەرەکی (بە مانای دەنگ و زمان) یان ناوەکی (بە مانای فیکری و زەینی و رۆحیە)، دەبێت هەروەك گفتوگۆی منداڵێك بێت لەگەڵ باوکیدا (خۆی بەو جۆرە بنوێنێت کە هەیە). ئەم قسەیە خوشکێکی مەسیحی وتویەتی کە (٣٠) سی ساڵ ژیانی خۆی بۆ خزمەتکردنی کەسانی تیاماوان و خاوەن پێداویستی دانا. (بە تەواوی بوونیانەوە بەو جۆرە نزا دەکەن کە خۆشیان دەوێت.)

بەڵام لەبارەی شێوە و فۆرمی نزاوە لە سەرنجێکی کورتەوە بۆ خودا تاکو سەفەری ڕۆحی و لە ووشەی زۆر سادە کە لە زمانی لادێیەکەوە لەبەرامبەر "کالور"، (تەپۆڵکەیەکی بچوکە کە جێگەی جێگیرکردنی صەلیبە.) تاکو جەلالی سرودی مەزهەبی "گرگواری"، (سرودێکە مەزهەبیە و لە لایەن "گرگواری" یەکەم ڕێکخراوە.) لە ژێر کلێسایەکی گەورە فۆرمی نزا گۆڕانکاری بەسەردا دێت. تەشریفات، مەزنی و شکۆ لە کاریگەری نزادا پێویست نییە. کەمتر کەسێك وەکو"سن جان دولاکروا"، (نووسەری چەند بەرهەمێکی تەسەوف و زوهد) یان "سن برنارد دوکلرو"، (لە گەورەترین کەسایەتیەکانی ئایینی مەسیح و نووسەر بەرهەمی زۆر گرنگ، ئەویش هەروەك "ئیمامی غەزالی" دەستی بۆ کێشمەکێشی عەقلانییەکان بردووە و دژایەتی کردوون.) نزایان بە شتی تەشریفاتی زانیوە.

بۆ وەرگرتنی نزا، پێویست بە ڕەوانبێژی ناکات.[1]

لەو ڕووەوەی کە بەهای نزا لەبەرامبەر ئەو سوودەی هەیەتی هەڵدەسەنگێنێت، سادەترین ووشەکانمان کە لاوازی و ستایش ڕوون دەکەنەوە، هەروەك جوانترین داواکان و نزاکان لەبەردەم خودادا هەرچی هەیە، وا پێدەچێت وەرگیراو بن. ئەو ووشانەی لەبەرکراون و بە شێوەیەکی نەویستانە دەردەبڕدرێن و هەروەها سوتانی گڕی مۆمێك، خودی جۆرێك نزا و پاڕانەوەیە.

ئەم هاوکێشە و وشانە و ئەم گڕە ماددییەی مۆم، بۆ ئەوەی هێمای فڕینی بوونەوەرێکی مرۆیی بەرەو ڕووی خودا بێت، شتێکی بەسە. بەکرداریش ستایش دەکەن. "سن لویی گنزاك" دەڵێت: ئەنجامدانی وەزیفە، هاوئاستی نزایە، بێگومان باشترین ڕێگەی پەیوەستبوون بە خوداوە ئەنجامدانی تەواوی ویست و داخوازی ئەوە.

(ئەی .... ئێمە! حکومەتی ئێوە بگات، ئیرادەتان لە زەویدا هەروەك ئاسمان فەرمانڕەوا بێت). "لە کتێبی پیرۆزەوە".

---

١. بەڵام ناتوانرێت ئەم خاڵە بە نادیدە وەربگیرێت کە ڕوانبێژی لە ڕۆحی ئەو کەسی نزا دەکات کاریگەری بە جێ دەهێڵێت و یارمەتی دەدات لە دۆزینەوەی ئەو حاڵەتەی لە وەرگرتندا کاریگەری هەیە. و ڕەنگی ئەو سەرنجدانەی لە ڕەوانبێژی دەقی نزا ئیسلامیەکاندا هەستی پێدەکرێت لەم ڕووەوە بێت. "د.عەلی شەریعەتی".

بێگومان ئەنجامدانی ویستی خودا بریتیە لە پەیڕەویکردنی یاساکانی ژیان، ئەو یاسا و ڕێسایانەی کە لە تانوپۆی جەستەی ئێمە، خوێن و ڕۆحمان تۆمار کراون.

ئەو نزایانەی هەروەك هەورێكی پڕ لە سەرزەمینەوە بەرەو خودا دەڕۆن، بە هەمان ئەو ڕێژەیەی کە نزاکەران لە رووی کەسایەتیەوە جیاوازن، لەگەڵ یەکتردا جیاوازییان هەیە، بەڵام ئەم نزایانە هەموویان لەسەر دوو بنەما وەستاون، ئەوانیش: هەژاری و عیشق.

بە تەواوی ڕێگەی ئەوە دراوە بۆ بەدەستهێنانی نیاز و پێداویستیەکانمان داوای یارمەتی لە خودا بکەین، بەڵام لە هەمانکاتدا شتێکی نامەعقول و نەشیاوە کە داوای لێ بکەین تاکو بەرگی کردار بە هەوەس و ئارەزووەکانمان بپوشێت و بیانهێنێتەدی و یان ئەوەی بە کۆشش و هەوڵدان دەکرێت بە نزا بیبەخشێت.

نابینایەك لە کەناری ڕێگەیەکدا دانیشتبوو و هەموو ئەو کەسانەی دەیانویست ئارامی بکەنەوە بە تەواوی هێزەوە لە دڵەوە هاواری دەکرد. "عیسی" کە لەوێوە تێپەڕی ووتی: ئیمانت شیفات بدات.

نزا، لە قۆناغی باڵاتریدا لە ئاستی ویست و دەربڕینی حاڵ و بارودۆخ زیاتر و سەرووتر دەڕوات. مرۆڤ لە بەرامبەر خودا بوون ئەوە پیشاندەدات کە خۆشی دەوێت، سوپاسی بەخششەکانی دەکات و ئامادەیە تاکو ویستەکانی هەرچی هەبن، ئەنجامیان بدات.

لێرەدا نزا بە شێوەی جووڵە و بزوتنێکی ڕۆحی و کەشفکردنێکی دەروونی دەردەکەوێت.

لەسەر تەختەیەکی دانیشتنی کڵێسایەکی خەڵوەت، لادێیەکی پیر دانیشتبوو.

پێیان ووت: چاوەڕوانی چین؟

ووتی: من سەیری ئەو دەکەم و ئەو سەیری من دەکات.

بەهای هەر هونەرێك وابەستە و بەستراوە بە ئەنجامەکانییەوە. هەر ڕێگەیەك بۆ نزاکردن، ئەگەر مرۆڤ لەگەڵ خودادا ڕووبەڕوو بکاتەوە، پەسەند کراوە.

## ● له کوێ و کەی دەبێت نزا بکەین؟

له کۆڵان، ئۆتۆمبیل، ئیداره، خوێندنگه و کاگه دەتوانرێت نزا بکرێت، بەڵام باشتر وایـه هەموو کەسێك له ماڵەکان، کوێستانەکان و دارستانەکان یـان لـه خـەڵوەتی ماڵەکەیـدا نـزا بکات، هەروەها کۆمەڵه پەرستشێك هەن که دەبێت له ماوەی مەراسیمی تایبـەتی کڵێسـادا ئەنجام بدرێن. بەڵام جێگەی نزا هەر شوێنێك بێت، خودا لەگەڵ مرۆڤدا قسه ناکـات، مەگـەر ئەو کاتەی ئارامی بێته ناو دەروونییەوه و ناخ و دەروونی داگیر بکات. ئـارامی و ئارامشـی ناخ و دەروون پەیوەندی هەیه به حاڵەتی ئەندامی و ماددی و ئەو ژینگەیەی که ژیـانی تێـدا بەسەر دەبەین.

دۆزینەوەی ئارامی جەسته و ڕۆح له نێـوان قـەرەباڵغی و ژاوەژاو و شـلۆقی کۆمەڵگـەی ئەمڕۆ کارێکی دژواره. ئەمڕۆ پێویستمان به شوێنێکی تایبەته بۆ نزا و پاڕانەوه. کڵێسـاکان باشترین جێگەن. دامەزرانـدن و دروسـتکردنی پـەناگای خێـر و چـاکه و ئاشـتی لـه نێـوان هەیاهوی شاردا نەگران و نەدژواره.

له سکوت و بێدەنگی ئەم پەناگایانەدا مرۆڤ دەتوانێت لەو حاڵەی کـه ئەندێشـه و بـیری بەرەو لای خودا له فڕیندایه، ئارامی به ئەندامـەکانی ببەخشـێت. ڕۆحـی سـوکبار بکـات و هێزی هەڵسەنگاندن و دیاریکردن پاك بکاتەوه و برەوی پێ بدات و توانای ئەو ژیانه دژوارەی که شارستانییەتی نوێ خستویەتیه سەرشانی و ئەژنۆی شکاندووه، بەدەست بهێنێت.

نزا کاریگەری لەسەر سیفەت و تایبەتمەندییەکانی مرۆڤ دادەنێت، لەبەرئـەوه دەبێـت نـزا ئەنجام بدات.

"ئیپکتت" دەیوت: (زیاتر لەوەی هەناسه دەدەیت، بیر له خودا بکەرەوه).

بەیانیان نزاکردن و ژیـان بەسـەربردن بـه درێـژایی ڕۆژ هـەروەك دڕندەیـەك، بێهودەیـه. کورترین ئەندێشەیەك بەسەر مێشکدا تێدەپەڕێت و یان ئەو ویست و داخوازییه پەنهانەی لـه

زیهنی مرۆڤدا تێدەپەڕێت، دەتوانێت مرۆڤ لەبەرامبەر خودادا دابنێت. لەمکاتەدا بۆ دۆزینەوەی هەر ڕێگەیەك دەتوانرێت ئیلهام لە نزاکردن وەربگیرێت.

لەبەرئەوە نزاکردن خودی خۆی ڕێگەیەکی ژیانکردنە. نزاکردن ئەگەر لە هەلومەرجی گونجادا ئەنجام بدرێت، هەمیشە ئەنجامێکی بەدواوە دەبێت. "رالف والدو ئیمرسون" دەنووسێت: (هیچ کەسێك هیچکات نزای نەکردوە، مەگەر ئەو شتەی دەستکەوتووە).

لەگەڵ بوونی ئەوەی خەڵکی سەردەمی نوێ وەکو خوویەکی فەرامۆشکراو سەیری نزا دەکەن و وەکو ڕێورەسمێکی خورافی و بەجێماو لە قۆناغی دڕندەیی دەزانن، لە ڕاستیدا دەتوانرێت بوترێت ئەمڕۆ ئێمە تاکو ڕادەیەك لە بەرهەمەکانی نزا بێبەش بووین. ئێستا ببینین و بزانین هۆکاری ئەم بێبەشبوونانە چییە؟

یەکەمین هۆکاری ئەوەیە کە ئەمڕۆ نزا زۆر بە کەمی ئەنجام دەدرێت. هەستی عیرفانی لە نێوان شارستانییەکاندا لە لەناوچووندایە؟. دەتوانرێت بوترێت ژمارەی ئەو فەرەنسیانەی نزا دەکەن لە (٤-٥٪) تێپەڕ ناکات.

دووەم: نزا ئەمرۆ زۆرجار بێ کاریگەرە، چونکە زیاتر ئەو کەسانەی ئەهلی پەرستشن، خۆویست، درۆزن، خۆبەگەورەزان و سەرکەش و ریاکارانەن کە شایستەیی عیشق و ئیمانیان نییە. بە هەرحاڵ بەرهەمەکانی نزا هەرچەندە بەدەست دێن، زۆرجار بە ئێمە ناگەن.

وەڵامی ویست و داواکارییەکان و عیشقەکانمان زۆرجار و بە شێوەیەکی گشتی بە شێوەی هێواش، نا بەرهەست و تاکو ڕادەیەك ڕێگەپێنەدراو دەدرێنەوە. ئەم وەڵامە کە بە وورتە وورتی زۆر نەرم دێتە ناو دەروونمانەوە لەگەڵ قیل و قالی جیهانی دەرەوە بە ئاسانی بێدەنگ دەبێتەوە.

هەروەها بەرهەمە ماددییەکانی نزا نەزانراو و لێڵ و نائاشکران و زۆرجار تێکەڵی دیاردەکانی تر دەبێت.

لە نێوان خەڵکیدا، تەنانەت کەشیشەکان، زۆر کەمن ئەو کەسانەی کە ئەم حاڵەتەیان هەبێت و بتوانن ئەم بەرهەمانە بە شێوەیەکی روون ببینن. پزیشکانیش لە رووەوەی کە جێگەی سەرنجیان نەبووە، ڕێگەی ئەوەیان داوە ئەو حاڵەتانەی لەبەردەستیاندا روویانداوە، بە بێ ئەوەی بیخەنە ژێر توێژینەوە و لێکۆڵینەوەوە لە ناو بچێت. لەسەرووی ئەمەشەوە ئەو کەسانەی

خەریکی ئەم بەرهەمانە دەبن، زۆرجار بەم هۆکارە دەکەونە هەڵەوە و تووشی لادان دەبن کـە لـە زۆربەی کاتەکاندا ئەو ئەنجامەی بەدەست دێت، لەگەڵ ئەوەی روودەدا، جیاوازی هەیە. بۆ نموونـە ئەو کەسەی نزا دەکات تاکو خـودا شـیفای نەخۆشـی ئەنـدامێکی جەسـتەی بـدات، بـەڵام لـە ئەنجامدا گۆڕانێکی قوڵ و تەفسیر قبوڵنەکراوی رۆحی و ئەخلاقی تووش دەبێت.

دابونەریتی نزا هەر چەندە لە نێوان خەڵکـە گشـتیەکە حاڵـەتی ئاراوتـە "اسـتپنایی"ی هەیە، بـەڵام لـە نێـوان ئـەو گروپانـەی کـە بەرامبـەر بـە مەزهـەبی باوباپیرانیـان وەفـادار ماونەتەوە، تا رادەیەك فراوانە. لەم گروپانەدایە کە دەتوانرێت ئەمڕۆ هێشـتا خوێندنـەوە بـۆ کاریگەرییەکانی نزا بکرێت.

لە نێوان بەرهەمە بێشومارەکانی نزادا، پزیشك شوێنێکی زۆر گونجاو پەیـدا دەکـات کـە توێژینەوە لە بەرهەمی کارئەندامزانی دەروونی "سایکۆفسیۆلۆژی" و دەرمانییەکەی بکات.

## • ونکردنی نزا لە نێوان گەل و نەتەوەیەکدا بەرامبەرە بە کـەوتنی تەواوی ئەم نەتەوەیە.

بە هەرحاڵ وەکو ئەوە وایە کە کاتی نزا، خودا گوێ بۆ مرۆڤ دەگرێت و وەڵامی دەداتەوە.

بەرهەمەکانی نزا وەهم و خەیاڵ نییە. نابێت هەستی عیرفانی تـاکو ئاسـتی دڵـەراوکێی مرۆڤێك لە بەرامبەر مەترسییەکان و شتە نادیارەکانی جیهان بهێنینـە خـوارەوە و هـەروەها نابێت لە نزا شەربەتێکی ئارامکەرەوە، دەرمانێکی دژە ترس - ترس لـە ئـازار، نەخۆشـی و مەرگ- ئامادە بکرێت.

کەواتە مانای هەستی عیرفـانی چـییە؟ سروشـت چ شـوێنێك لـە ژیانمانـدا بـۆ نزاکـردن تایبەتمەند دەکات؟ بە هەرحاڵ ئەم جێگە و شوێنە زۆر شایەنی گرنگی پێدانە.

تاکو رادەیەك لە هەموو قۆناغەکاندا خەڵکی رۆژئاوا نزایان کردوە. کۆمەڵگەی کـۆن لـە بنەڕەتدا رێکخراوێکی مەزهەبی بوو. رۆمیەکان لە هەموو شـوێنێکدا پەرسـتگەیان هـەبوو. باوباپیرانی سەدەکانی ناوەڕاسـتی ئێمـە سـەرزەمینی مەسـیحیەتیان بـە کڵێسـای گـەورە و میحرابی "گوتیك"، (جۆرێـك شـێوازی بیناسـازی کـە بـۆ خێڵـی "گـوت" دەگەڕێتـەوە و لەسەدەکانی ناوەڕاستدا بوونی هەبووە.) دادەپۆشی.

لە سەردەمی ئێمەدا هێشتا لـە بـەرزایی هەرلادێیەکـدا گومـەزێك بـوونی هەیـە. ئـەو کۆچەرانەی لە ئەوروپاوە هاتوون لەگەڵ زانکۆ و کارگەکاندا، بەڵکو بـەهۆی کڵێساکانیشـەوە لە کیشوەری نوێ "ئەمریکا" شارستانییەتی رۆژئاواییان بەرپا کردوە.

لە درێژای مێژووی ئێمەدا، نزا لە ریزی پێداویسـتیە سـەرەتاییەکان، لـە ریـزی جـەنگ، پێکهاتە و بینا، کار و خۆشویستندا بوونی هەبووە.

حەقیقەت وا پێدەچێت کە هەسـتی عیرفـانی بزوتنەوەیەکـە کـە لـە قـوڵایی فیترەتمانـە سەرچاوە دەگرێت و غەریزەیەکی سەرەکیشە، گۆڕانکاری و گۆڕانەکانی ئەم هەستە هەمیشـە پەیوەندی لەگەڵ گۆڕان و گۆڕانکاریە ناوەکیەکانی مـرۆڤ، وەکـو هەسـتی ئـەخلاقی، خـوو و سروشت و هەندێك جار هەستی جوانییەوە هەیە.

ئەم هەستانە بەشێکی زۆر گرنگی بوونی خودی ئێمەن کە ڕێگەی ئـەوەمان پێـداون لاواز بن و زۆرجار بەرەو لەناوچوون و نابوودی بڕۆن.

دەبێت ئەوەمان لەبیر بێت کە مرۆڤ ناتوانێت، بە بێ مەترسی، بـە حـەز و مـەیلی دڵـی خۆی رەفتار بکات. بۆ بەدەستهێنانی سەرکەوتن لە ژیاندا دەبێت پەیڕەوی لەو ڕێسـا و یاسـا جێگیرانە بکەین کە سیستەمی زانست دایان دەنێت.

ئێمە مەترسی "موجازفە"یەکی ترسناك دەکەین کاتێك کاتێك ڕێگە ئەوە دەدەین چـەند چالاکیەکی سـەرەکی و بنـەڕەتیمان بمـرن کـە بـە بەشـێکی سـامانی فسـیۆلۆژی و فیکـر و سۆزداریمان دەژمێردرێن.

بۆ نموونە: نەبوونی گەشـەی ماسـولکەکان، پەیکـەر و چـالاکیەکانی ژیـان (نـەك هێـزی عەقڵی) لەو خەڵکانەی کە خاوەنی هێزی عـەقڵین، هـەمان رادە شـوم و بەدبەختیـە کـە لـە لاوازی هێزی عەقڵی و هەستی ئەخلاقی لە نێوان وەرزشکاران و پاڵەوانانندا ڕوودەدات.

نموونە گەلێکی زۆر لە خێزانی پڕ لە دایکبوون و بەهێز هەن کە یـان بەشـێکی بەرهـەمی ناتەواو بەبارناهێنن و یان ڕوو لە لەناوچوون دەکەن.

پاش داڕووخان و پوکانەوەی بیروباوەڕی باوباپیران و ونبوونی ڕێز و دەمـارگیری بەرامبـەر دابونەریتی خێزانی، بە ئەزموونێکی سەختی ئـازاراوی و تـالاّ ەوە فێـر بـووین کـە ونبـوونی هەستی ئەخلاقی و عیرفان لە نێوان زۆربـەی ئەندامـە چـالاکەکانی نەتەوەیەکـدا، زەمینـەی لەناوچوونی تەواوی نەتەوە و سەرکردەکانی لە بەند و کۆتی بێگانەدا دەبینێتەوە. لەناوچـوون و کەوتنی یۆنانی کۆن هۆی هۆکارێکی لەجۆرە بوو.

شتێکی بەڵگەنەویستە کـە پوکانـەوە و داڕووخـانی چـالاکیە فیکـری و ڕۆحیـەکان کـە سروشتی ئێمە دەیانخوازێت لەگەڵ بابەتی سەرکەوتن لە ژیاندا پێچەوانەیە.

چالاکیە ئەخلاقی و مەزهەبیەکان بە لەڕووی کرداریەوە پەیوەندییان بە یـەکترەوە هەیـە. هەستی ئەخلاقی پاش مەرگی هەستی عیرفانی، ڕوودەدات.

مرۆڤ لە دروستکردنی سیستەمێکی ئەخلاقی سەربەخۆ لـە مەزهـەب، بـەو جـۆرەی کـە "سوکرات" دەیویست، سەرکەوتوو نەبووە.

ئەو کۆمەڵ و کۆمەڵگەیانـەی کـە پێویسـتی خۆیـان بـە نـزا لەناوخۆیانـدا کوشـتووە و لەناوبردووە، هەمیشە لە گەندەڵی و لەناوچوون بێ خەم نابن و رزگارییان نابێـت. ئەمـە لـەو روەوەیە کە کەشانی شارستانی بێ ئیمانیش هەروەك خەڵکی ئایینداز وەزیفە و ئەرکیان هەیە کە دڵ وابەستەبوون بۆ بابەتی گەشەی هـەموو چـالاکیە دەروونـی و ناوەکیـەکانی خۆیـان ك پێداویستی و پێویستی بوونێکی مرۆییە، پەیدا بکەن.

چۆن و لەسەر رووی چ بنەمایەك هەستی عیرفانی رۆڵێکی لەمجۆرە لە سەرکەوتنی ژیانـدا دەگێڕێت؟ بە چ میکانیزمێك نزا کاریگەری لەسەرمان دادەنێت؟

لێرەدا ئێمە قەڵەمڕەوی بینین و توێژینەوە دەخەینەو لاوە و دەسـت بـە دامێنـی گریمانـە دەگرین. گریمانە و تەنانەت رێکەوت لە پێشکەوتنی زانست و مەعریفەتدا پێویسـتە. دەبێـت سەرەتا ئەوەمان لەبیر بێت کە مرۆڤ، یەکەیەکە، نیوەی لە ئاو و گڵ، نیوەی لە گیان و دڵ.

لەبەرئەوە ناتوانین بە شێوەیەکی گشتی لە چوار بوار و لایەنی فـەزا و کـات و شـوێن دەرك بکەین. لەبەرئەوە ئەو نیوەی دووەمە، واتە هەست و رۆحـی مرۆیـی گەرچـی لـە ئەندامـەکانی ئێمەدا نیشتەجێیە، بەڵام لە هەمانکاتدا لە دەرەوەی ئەم جیهانە ماددییەدا بەدوایدا دەڕوات.

لە لایەکی دیکەوە، جەستەی زیندوو کە سەربەخۆ لـە شـوێنی مادديـدا، واتـە جیهـانی سروشت خۆی پیشان دەدات، بەشـێکی دانەبڕاویـەتی. چـونکە هـەر ئـەم جەسـتەیە بـەهۆی پێویستبوونی هەمیشەییەوە بۆ ئۆکسجین، هەوا و ئەو خۆراکەی زەوی بۆ بەرهـەم دەهێنێـت، میهرەبانانە پەیوەندی و پەیوەستەگی هەیە.

ئێمە دەتوانین باوەڕمان بەو جۆرە بێت کە لە بازنە و کـانونێکی مەعنەویـدا نـوقمین کـە تیایدا زیاتر لە جیهانی ماددی (هەوا، زەوی) هەنگاو هەڵدەگرین.

ئەم بازنە مەعنەوییە جگە لەو بوونەوەرە جاویدان و ئەوەی دەیەوێت دەیکـات و نـەمر و ئەبەدی و لە نێوان هەموان و بەرزتر و سەرووتر و باڵاتر لـە هـەموان کـە بـە خـودا نـاوی دەبەین، شتێکی تر نییە.

لەبەرئەوە دەتوانرێت نزا بە جێگرەوەی پەیوەندییە سروشتییەکانی نێو رۆحی مرۆیی لەگەڵ نیشتمانی زانراو و جێگەی بنەڕەتی و سەرەکی بزانین و وەکو چالاکیەکی ژیانی کە پەیوەستە بە پێکهاتەی بوونمانەوە دەربڕین، بە دەستەواژەیەکی تر بە چاوی کردارێکی ئاسایی جەستە و رۆحمان سەیری نزا بکەین.

- **کاریگەرییەکانی نزا**

نزا کاریگەری لەسەر رۆح و جەستەمان دادەنێت. ئەم کاریگەریە پەیوەندی بە چۆنییەتی، توندی و بەهێزی، بەدوایەکداهاتنی نزاوە هەیە.

ناسینی ئەوەی کە "بەدوایەکداهاتن"ی نزا چییە، ئاسانە. تاکو سنوورێك دەتوانرێت توندی و بەهێزی بدۆزرێتەوە، بەڵام چۆنییەتیەکەی سەرزەمینێکی نەناسراوە، چونکە ئێمە پێوەرێکمان بۆ هەڵسەنگاندنی ئیمان و پێوانی عیشقی ئەوانیترمان لەبەردەستدا نییە. لەگەڵ ئەوەشدا رێگەی ژیانی ئەو کەسەی خەریکی نزاکردن دەبێت، دەتوانێت ئاشنامان بکات بە چۆنییەتی ئەو بانگکردنەی کە ئەو کەسە لەبەردەمی خودادا دەیکات.

تەنانەت ئەو کاتەی نزا تاکو ئاستێکی نزم دێتە خوارەوە و بەشێوەی دووربڕین و وتنی توتی ئاسا هاوکێشەی دیاریکراو دروست دەبن، راهێنانێك بۆ پەیدابوونی زەمینەیەکی ئەخلاقی تەواو رۆحی دەژمێردرێت و هەستی عیرفانی و هەستی ئەخلاقی بەیەکەوە بەهێز دەکات. لە روخساری ئەو کەسانەی کە خەریکی نزاکردن دەبن تاکو رادەیەکی جێگیر هەستی ئەرکناسی، کەمی بەخیلی و حەسوودی و شەڕانیبوون و تاکو ئەندازەیەك هەستی چاکی و خێرویستی بۆ بەرامبەرەکان و ئەوانیتر دەخوێنرێتەوە.

بەڵگەنەویست دێتەپێش چاو کە لە کاتی یەکسانی هێزی مێشك و زانستی نێوان دوو کەس، خوو و سیفەتی ئەخلاقیان تەنانەت بەشێوەیەکی زۆر ئاسایی و مام ناوەند نزا دەکەن، تەواوکارتر لەویترە.

نزا ئەو کاتەی پڕ شەوق و گەرمیە، کاریگەری باشتر ئاشکرا دەبێت. ئەم جۆرە نزایە کەمێك لەگەڵ هۆرمۆنەکانی غودەی "سایرۆید" و "سورناڵ" شایەنی لێکچوونە.

وتویانە لە قوڵایی ویژداندا شوعلە و گڕێك داگیرساوە. مرۆڤ بەو جۆرەی کە هەیە، خۆی دەبینێت، لە خۆویستی، حیرص، گومڕاییەکان و فیکرە و بیرە خواروخێچەکانی و لە سەرکەشی و خۆبەشت زانینی پەردە هەڵدەماڵێت. بۆ ئەنجامدانی ئەرکی ئەخلاقی رام دەبێت. بۆ بەدەستهێنانی سەردانەواندنی فیکری هەنگاو هەڵدەگرێت، هەر لەم هەنگاوەدا دەسەڵاتی پڕ لە لێخۆشبوون لە بەرامبەریدا دەردەکەوێت.

وورد ە وورد ە ئاشتیەکی دەروونی، هەماهەنگی و سازشی خۆشی چالاکی دەماری و ئەخلاقی، گەورەترین توانای بەرگەگرتن لە بەرامبەر بێبەشبوون، تانە، غەم، توانای شکاندنی قبوڵنەکراو و سستی نەناس، خۆراگری و ئارامی لە بەرامبەر لە دەستدانی هەموو شتێك، ئازار، نەخۆشی مەرگ بەرەو رووی دێت.

پزیشکیش کاتێك نەخۆشی بینی کە دەست بەدامانی نزا و پاڕانەوە ئەنجام دەدات، دەتوانێت خۆشبەخت و دڵخۆش بێت، چونکە ئەو ئارامیەی کە نزا بە خەڵات بۆی هێناوە، بە کۆمەکیەکی شایان لە چارەسەرکردنیدا دەژمێردرێت.

لێرەدا نابێت نزا بە هاوریز و هاوپۆلی "مۆرفین" بزانین، چونکە نزا لە هەمان ئەو کاتەی ئارامی دروستکردوە، بە شێوەیەکی تەواو و راست چالاکیە هزری و مێشکیەکانی مرۆڤی جۆرێك سەرسوڕهێنەری، فراوانی و والابوونی ناوەکی و هەندێجار قارەمانی و ئازایەتی دەجولێنێت.

نزا تایبەتمەندییەکانی خۆی بە نیشانەی زۆر دیاریکراو و سنوردار بە تاکێك پیشان دەدات. خۆشی نیگا، نەرمی رەفتار، فراوانبوون و شادی بێ دوودڵی، روخساری پڕ لە یەقین، ئامادەگی رێنمونیکردن و هەروەها پێشوازیکردن لە رووداوەکان، لە باوەشگرتنی سەربازێك

یان شەهیدێکی مەرگ بە سادەیی لە باوەش دەگرێت. ئەمانـەن کـە حیکایـەت لـە بـوونی گەنجینەیەکی پەنهان لە قوڵایی جەستە و رۆحماندا دەکـەن. لـەژێر ئـەم توانـا و دەسـەڵاتەدا تەنانەت خەڵکی بێئاگـا و دواکـەوتوو، لاواز و کـەم تواناکـانیش دەتـوانن هێـزی عـەقڵی و ئەخلاقی خۆیان باشتر بەکاربهێنن و بـەهرەی زیـاتری لێـوەربگرن. وا پێدەچێت کـە نـزا بـە جۆرێك گەشە بە مرۆڤەکان دەدات کە ئەو بەرگەی بۆماوە و ژینگە بۆ باڵای دووریون، بۆیـان کورت بێتەوە. چاوپێکەوتنی پەروەردگار پڕ لە ئاشتی و ئارامی دەروون دەکـات بـە جۆرێـك تیشکدانەوەی نووری ئەم ئاشتیە لە روخسـاریاندا دەردەکـەوێت و بـۆ هـەر جێگەیـەك بـڕۆن لەگەڵ خۆیاندا دەیبەن.

بەڵام بە داخەوە ئەمڕۆ لە دونیای ئێمەدا، بەشێکی کەمن ئەو کەسانەی نزا لە روخساری راستەقینە و حەقیقیەکەیدا بناسن.

بەرهەمە دەرمانییەکانی نزا کە لە تـەواوی قۆناغەکانـدا سـەرنجی خـەڵکیان بـۆ خۆیـان راکێشاوە، ئەمانەن. ئەمڕۆش لەو جێگایانەی دەست بـە نزاکـردن دەکـەن و پێـوەی خـەریك دەبن، زۆر قسە دەکەن لەبارەی ئەو شیفایەی بە بە پشـت بەسـتن و پەیوەسـتبوون و گفتوگـۆ لەگەڵ خودا بۆتە بەشی ئەو کەسانەی نزا دەکەن. بەڵام کاتێك بابـەتی پەیـدابوونی شـیفا لـە نەخۆشیەکی گومانکراودا بە شێوەیەکی خۆبەخۆ و یان بە یارمەتی دەرمانی ئاسایی دروسـت دەبێت و روودەدات، زۆر کێشەیە بزانین هۆکاری واقیعی ئەم شیفایە چی بووە.

تەنها لە بارەی بەرهەم و ئەنجامەکانی نزاوە دەتوانرێـت بـە دڵنیاییـەوە بـە لێکۆڵینـەوە بگەین کە هەموو رێگاکانی دەرمانکردن شتانی کرداری نین یان رەد بکرێنەوە.

رێکخراوی "پزیشکی لۆرد"، (شوێنێکە خەڵکانی مەسیحی بۆ داواکردن و سەردان بـۆی دەچن و پێداویستیەکانی خۆیان لە حەزرەتی "مەریەم" داوا دەکـەن.) خزمـەتێکی زۆری بـە زانست کردوە کە لە راستیدا ئەم جۆرە شیفایانەی سەلماندوە.

هەندێجار نزا کاریگەری سەرسوڕهێنەری هەیە. نەخۆش گەلێك هەبوون کە تاکو رادەیەك بە شێوەیەکی کاتی لە دەردەکانی وەکو، شێرپەنجە، هەوکردنی گورچیلە و زامی درێژخایـەن و

ئەنجامی بەرپرسیارییەتیەکەی بێت، نە ناچارە هەوڵبدات تاکو لە کەڵکەڵەی سەرکەوتن یان شکست بێت، نە رەنج و ئازار دەبات تاکو بەدوی راکردن لە ئازارەوە بێت، نە گرفتاری هەیە تاکو لە گەڕان بەدوای رەهایی و رزگاریدا بێت. نە ناکام و ناتەواوە تاکو لە هەوڵی تەواویدا بێت. نە برسیە تاکو بیر لە نان بکاتەوە. نە ناتەواوی و بێبەشی هەیە، تاکو ئامانجێکی هەبێت و پەیمان و بەڵێندان و مەشغوڵبوونی زەینی، تاکو کاتەکانی بەوە پڕ بکاتەوە. لە هەموو ئەم واقیعییەتانە خاڵیە. مرۆڤێك هەرچی بخوازێ بۆی فەراهەم بووە. لەوەی کە نازانێت دەبێت چی بخوازێ، رەنج دەبات. مرۆڤێك لە ژیانیدا دەرگیری نەبێت، هەوڵ و خەبات و رەنج و ئازار و ناتەواوی و کەموکورتی نییە، ئومێدی نییە، ئامانجی نییە و لە ئەنجامدا مانای نییە، ژیانی لایەنگری و رووگەی نییە، بوونی پەیمان و بەڵێنی نییە، مان و نەمانی بیانووی نییە، جیهانیش بۆ ئەم کەسە جێگای تێگەیشتن نییە، سروشت بە بێهودەیی دەگات. باوەڕی بە پوچی دەبێت، هەموو شتێك، مرۆڤ و جیهان بە پوچ دەبینێت.

فەلسەفەی بێهودەیی و پوچی لێرەوە دەست پێدەکات: لە جیهانبینی فەلسەفی، لە جیهانبینی چینایەتی بۆرجوازێك سەرهەڵدەدات. بێهودەیی "Absurdite" کە ئەمڕۆ رۆح و فەلسەفەی بەربڵاوی رۆژئاوایە، کەشف و دۆزینەوەی ئاغای "ئەلبێرکامۆ" نییە، زادەی بلیمەتی "سامۆئیل بیکت" نییە، دۆزینەوەی حەقیقەتی هۆش وپەرجووی فەلسەفی دەاغی بیرمەندانی گەورەی رۆژئاوا نییە. پاشماوەی سکی بێگانەیە، سکی تێری بێگانە! بێگانەیەك کە دەخوات و ئاسیایی و ئەفریقی کاری بۆ دەکەن، کاتژمێرێك کاری جوانکاری دەکات و سەد مارك وەردەگرێت و ئەوەی دەمێنێتەوە سەما دەکات و دەنوشێت و دەخواتەوە و کەرنەڤاڵ دەخاتەڕێ و سەرگەمی و خەرکیبوون کە ئامانجی ژیانی رۆژئاوایە، دروست دەکات، جارێکی تر چەندین کاتژمێر کاتی بەتاڵی بۆ دەمێنێتەوە و نازانێت چیان لەگەڵدا بکات؟ خواردنی بێ رەنجی و ئازار و یاریکردن، وردە وردە ئارامی دەهێنێت، ئەم مرۆڤ دونیا هیچ لە هیچدا دەبینێت و یەکجۆر و ترسی و دوو دڵی لە هیچ شتێك نییە، هەست بە ترس و کەمی ناکات، ئامانجێك لە کاردا نییە، لە بنەڕەتدا ژیان مانایەکی بۆی نییە، دیار نییە

بۆچـی دەژی؟ بۆشـایی لـە ژیـان، خـاڵیبوون لـە دونیـا، بێمانـا بـوون لـە "بـوون" و بـێ فەلسەفەبوونی بوونی مرۆیی و هیچ بوونی هەموو شتێك لە روانـین و بۆچـوونیدا بەرجەسـتە دەبێت.

پوچی و هیچی لە فەلسەفەی نوێدا، لە هونـەری نوێـدا، شـانۆنامەی پـوچ، فەلسـەفە و جیهانبینی پوچ لێرەوە دەست پێدەکات، لە مرۆڤی پوچ و ژیانی پوچ. چونکە ئەو مرۆڤەی لە ژیانی کۆمەڵایەتیدا بۆ ژیانکردن، هـیچ مەشـغولی و خۆخـەریکبوونێك، هـیچ پەیمانـدانێك، کارێك، رەنج و ئازارێك، بەرپرسیاریەتێکی نییە، ژیانی خـاڵی و یـەکجۆری هەیـە. هونـەری ئەوروپی و فەلسەفەی ئەوروپی بۆ پرکردنـەوەی ئـەم بۆشـاییەی ژیـان لـە چـینی بۆرجـوازدا دێتەدی و فەلسەفەکەی بۆ ئەوەیە کە دەڵێت ئاسمـان خاڵیـە، جیهـان شـێتە، بـوون خـاوەنی هەست و تەگبیرە و بوون "وجود" لەسەر گەمژەیی بونیاد نـراوە و راسـتیش دەڵێـت، بـوونی خۆی دەڵێت، جیهانی چینایەتی خۆی دەڵێت و راست دەڵێت کە ژیـان پوچـە، هونـەر پوچـە، ئامانجی ژیان پوچە...! هونـەری دروسـتکردن و سـەرگەرمی دروسـتکردنە. هەنـدێجار ئـەو فیلمانەتان بینیوە کە لە بنەڕەتدا لە شەو نشـینییەکانیاندا، لـە دانیشـتنەکانیاندا هەمیشـە بەدوای جۆرێك لە یارییەکان، کارەکان، نومایشی جوڵێنەر، وروژێنەر و دوودڵ دەبن، بۆچـی؟ چونکە ژیانیان دوودڵی نییە، چونکە چینەکانیان دوودڵـی نییـە، لەبەرئـەوەی تـاکو کۆتـایی تەمەنیان هیچ رووداوێك لە ژیانیاندا روونادات، دوودڵی لـە برسـیەتی، هـەژاری، کـار، لـە دەستدان، بێبەشبوون و کەمی و نیازیان نییە. ئەو کەسەی لە ژیانێکی ووشك و بـێ جوڵـە و یەکجۆری بەردەوام ژیان بەسەر دەبات ، دڵ زەدە دەبێـت و لـەم یەکجۆریـە بەردەوامـە ژیـان بەسەر دەبات و بەدوای وروژاندا دەگەڕێت، بەدوای خەریکبوونی زەینیدا دەگـەڕێت، بـەدوای دروستکردنی شتانی سەرسوڕهێنەر و دەگمەنـدا دەگـەڕێت، بـەدوای چاوبەسـتدا دەگـەڕێت، بەدوای ئامادەگی رۆحەکان و جنۆکەدا دەگەڕێت، نیازمەندە بەرامبـەر ئـەو شـتەی وروژان و سەرسوڕهێنەری دروست دەکات. ئەمە گەڕانەوەیەکی درۆزنانەیە کـە ئـەمرۆ ئـەوروپا بـەرەو زەینییەتگەرایی، بە گوتەی خۆیان و بە دەسـتەواژەی زۆرێـك بـەرەو مەعنەوییەتگـەرایی و رۆژهەڵاتگەرایی و سەرنجدان و رووکردنە سوننەتە دێرینەکانە و بەرەو زانسـتە دەگمەنـەکان و

بەرەو بابەتگەلی لادەری غەیبیــە. ئــەم لایەنگریــەی کــە رۆژئــاوای ئــەمڕۆ پەیــدای کــردوە، لایەنگری لادەرانەی رۆحێکی ئاسوودەیە لە واقیعییەت و خاڵی لە حەقیقەتی ژیانە.

بنــەڕەتی ئــەم ئایدیالیزمــەی کــە وتم، واتــە ئــەو مەعنەویتگــەرایی و خودگەراییــەی و دەروونگەرایی و رۆژئاوا لەسەر ئەوەیە کە مرۆڤ لە جیهاندا تەنهایە. بە گوتەی "هایدگــەر": (مرۆڤ لە سنگی ئەم سەحرای سروشتەدا فڕێدراوە و پەڕیوەتە نــاوی). مــرۆڤ دەســتی ناگاتــە هیچ شوێنێك. مرۆڤ عاق بووی خودایە، تەنانــەت "ئــەلبێرکامۆ" دەڵێــت: (مــن سەرکەشــی دەکەم، بۆچی سەرکەشی دەکەم؟ لەبەرئەوەی جیهان دژی مرۆڤبوونی منــە، لەبەرئــەوەی ئــەم جیهانە لەسەر بنەمای ستەم و سنووربەزاندن بۆ مرۆڤ دروســتکراوە، لەبەرئــەوە مــن رەخنــە دەگرم دژی خودا، بەڵام خوداش بوونی نییە!). ئافەرین! مستەکۆڵەدان لــە هــەوا! ئەمــە کــە پاڵەوانی پێ ناوترێت، من دژی کەسێك رەخنە دەگرم کە بوونی نییە! دیسانەوە ئەمە چ جــۆر سەرکەشی و رەخنەگرتنێکە؟ سەرکەشی دژی هیچ کەس، رەخنەگرتن دژی کەسێك کــە خــۆت دەڵێی بوونی نییە؟

تــــەواوی ئــــەم فەلســــەفانە، فەلســــەفەی شکســــتی "ســــارتەر"، فەلســــەفەی پوچــــی "ئەلبێرکامۆ"، فەلسەفەی هیچی "ئەندەر ژید"، بێگانــەیی "هایدگەر"...هتــد هــەموویان دەستەواژەگەلی جۆراوجۆر و جیاوازی واقیعییــەتێك و ئــەویش قــەیرانی رۆحــی مرۆییــە لــە شارستانییەتی نوێدا.

"ئەندەر ژید" بیرمەنــدێکی مەزنــە. دەڵێــت هــەموو کــارو کردەوەکــانی مــرۆڤ پووچــن "Absured". پرسیاری لێ دەکەن پوچی چییە؟ دەڵێت: پوچی وەکو کــرداری ئــەم پیاوەیــە کە بەیانی زوو لە ماڵەی دێتە دەرەوە، زۆر بەڕێز و بە ئەدەب و لەسەرخۆ، لەســەر کــۆڵان بــە کەسێکی سەرپێچیکار دەگات، لەناکاو بێ پێشەکی و بێ ئاشــنایی، زللەیــەك لــە بنــاگوێی کابرای بەڕێز دەدات! پاشان ئەم پیاوە بەڕێزەش رەخنە دەگرێت و دەڵێت: بۆچی؟ پیــاوی زللــە وەشێن بە بێ ئەوەی وەڵامێك بداتەوە رێگەی خۆی دەگرێتەبــەر و دەڕوات. ســبەینێ بــەیانی

کاغەزێکی فەرمی بۆ ئەو کابرایە دەنووسێت کە زللەکەی لێداوە و لە کاری دوێنێی داوای لێبوردن دەکات!

باشە مانای ئەم کردارە چی بوو؟ هیچ! ئەمە مانای کارێکی پوچن!

ژیانکردنی ئێمە ئێستا لە بەیانییەوە تاکو شەو بەجۆرەن. ئێمە لەبەرامبەر ژیانمان هەر بەجۆرە کارەکان ئەنجام دەدەین. کۆتاجار کە لە کەسێك دەدەین کۆمەڵێك کە هاوڕان لەگەڵمان هەر ئەمکارە ئەنجام دەدەن، کرداری ئێمە، دەبێتە کردارێکی لۆژیکی و بە لۆژیکی و ژیرانە دەردەکەوێت. ئەو کەسەی کە لێدان دەخوات، کاتێك رەخنە دەگرێت، لەبەرئەوە ئەوانیتر لەگەڵ رەخنەکەیدا هاوڕان، کارێکی لۆژیکیە، بەڵام کۆی ئەو کردار و رەفتارانەی کە ژیانی مرۆڤ لەسەر رووی زەویدا دەسورێنێتەوە و دیاری دەکاتن کار و کرداری پوچن. واتە هەر بەجۆرە، سەرکەش، پێکەنیناوی، شێتانە و گەوجانە و بێهودە، بێ مانا، بێ ئامانج!

ئەمە ژیان بورجوازی خۆشگوزەرانی ئەمرۆیە کە بەجۆرەیە. بۆچی ئەم فەلسەفانە هەموویان بە هیچی و پووچی لە جیهاندا دەگەن؟ بنەڕەت و بنەما لەسەر ئەوەیە کە ئەم زانایانە، بیرمەندە گەورانە ناتوانن بەو جۆرەی کە سەرمایەداری و هزری ماددی و بیری بازرگانانەی سەدەی (١٨) و (١٩) رایدەگەیاند، هەست و نیاز و پێویستی و حەز و هەموو پێداویستیەکانی مرۆڤ لە دابینکردنی بەکارهێنانی هەرچی زیاتر و خۆشگوزەرانی هەرچی زێدەتر بە سنووردار بزانن، پێداویستی ئەودیوسروشت و سەروو سروشتیان هەیە. بە گوتەی "ئیقباڵ": پێویستیان بە راڤە و تەفسیرێکی رۆحانی هەیە بۆ جیهان، پێویستیان بە پێگەیەکی بیروباوەڕی هەیە لەم جیهانەدا، پێویستیان بە بەیەکگەیشتنێك، بە پەیوەستبوونێکی هەست، بە ئومێدێکی مەزن و گەورە، پێویستیان بە مانایەك هەیە بۆ گەردوون و پەیدای ناکەن و نایدۆزنەوە. لەوەی کە زەویە، لەوەی کە بەرهەمهێنان و بەکارهێنان و بەکارهێنانەکانی ژیانی خۆشگوزەرانی ئەوروپاییە، بێزارن، هەست بە کەمی دەکەن، و پاشانیش کە بەو "هەبووە" ناگەن، خۆبەخۆ بە پوچی دەگەن و بێزاری لەوەی کە هەیە و نەزانین و نەزانی لە بەرامبەر ئەوەی کە نییە و ناپەیدایە. ئەمە گەیشتنە بە پوچی، خاڵیبوونە، گەیشتنە بە خاڵیبوونە کە هزر و بیری ئەوروپی و فەلسەفە و هونەری ئەوروپای

ئەمڕۆ پێی دەگات، ئەمەش مانای ئـەو خودگەراییــە کـە لەسـەر تـەنیایی بونیـاد نـراوە و بنەماکەی تەنیاییە. تەنیابوونی مرۆڤ و تەنیابوونی مرۆڤ لە بووندا، خۆبەخۆ بـە ئێـرە و ئـەم شوێنە دەگات. ئەو مرۆڤەی کە بە ژیانی رۆژانە و ماف و پلە و داهات و جلوبـەك و خـۆراك تێـر دەبێـت، ئـەویش خۆشـبەختە، خـۆش بـەحاڵی، لـە بەهەشـتدا ژیـان بەسـەر دەبـات، بەهەشتێکی گیاندارانە و ئارامی گیایی، بە گوتـەی "لائۆتسـو": ئارامیـەك وەکـو ئـارامی درەخت و تێربوونێك وەکو تێربوونی گیا.

بەڵام ئەو کەسەی کە لەم پێداویستی و نیازانە تێدەپەڕێت، هەست بە خاڵیبوون، غوربەت و تەنیایی دەکات.

بەڵام نزا بریتیە لە تەجەللا و دەرکەوتەی ئەو رۆحەی کـە وەکـو واقیعییەتگـەرای نـزم و پەسـت و ئـەو واقیعییەتگەراییـە رووکەشـەی دونیـا کـە هەیـە، نایـەوێت لـە چوارچـێوەی نزمبوونەوە و لە سنووردارببوونی ئەوەی کە هەیـە بمێنێتـەوە و لـە نزمـی ئـەوەی کـە هەیـە رادەکـات و لـە نیـاز و پێداویسـتیە ماددییـەکان و ئـەوەی لەبەردەسـتی ئەودایـە، نیـاز و پێداویستی باڵاتری هەیە و کۆششێك بۆ گەیشتن بۆ باڵاتر و بەدەستهێنانی نیاز و پێداویستیە باڵاکانی هەیە و بە بێگانەیی و تەنیایی لە غوربەتی جیهان و کەمبوونی و ناتـەواوی ژیـانی ماددی گەیشتووە، بەڵام هەروەك تەنیایی رۆحی ئەمڕۆی ئەورووپی، باوەڕی بە پوچی و هیچی رەها نییە و ئەم نیاز و پێویستی و دوودڵی و کۆششە تیایدا، پەیوەستە و بۆ رۆحێکـی تـەنیا نییە، بەڵکو پەیوەست و دەگەڕێتەوە بۆ رۆحێکی عـاشیق، بـۆ رۆحـی بـەجێماو، دوورخـراوە، بڕاوە!

ئەو شتەی کە وتم ئەوەیە کە دەبێت لە جیـاتی "تـەنیایی"، "جیـایی" دابنـێم. رەنـج و هەوڵ و کۆشش و دوودڵی و هەست و عیشقی دەروونی و فیکری کـە مـەزهـەب و عیرفـان و هونەر لـەوەوە دەرکـەوتوون و تەجـەللایان کـردوە، بەدرێـژایی مێـژووی مرۆڤایـەتی، زادەی جیایین، هەستی جیایی، نەك هەستی تەنیایی. تەنیایی لەگەڵ جیاییدا چ جیاوازییەکی هەیە؟ تەنیایی واتە "بێ کەسی"، جیایی واتە "بێ ئەوی"، مانەوە بە بێ ئەو. مانەوە بە بێ ئـەو،

واتە هەبوونی ئەو و خۆشویستنی ئەو. لە بووندا، لە جیهانـدا، لـە هـەبوودا، لایـەنگیربوون. ئامانجی بالاّ و هەبوونی مەزنی لە بووندا، هەبوونی ناونیشان بۆ مرۆڤ. واتـە مـرۆڤ بەشـێکە بەجێماو، تاك و ئەگەر بۆخۆی بە جێ بهێڵرێت بـە ناونیشـانی بەشـێکی مـردوو و بەسـتوو، وەکو شتەکانی سروشـت دەمێنێتـەوە، دەترسـێت، هەوڵـدەدات خـۆی پەیوەسـت بکـات بـە رۆحێکی گەورەوە، بە کانونی ژیانی مەزنی بوونەوەران، هەوڵدەدات بۆ بالاّبوون، پێشـکەوتن، هەوڵدەدات و حەسرەتی هەیە بۆ رۆیشتن و گەیشتن بۆ بالاّبوون، هەروەها رادەکات و بێـزارە و هەمیشە دەترسێت لەو دۆخەی کە هەیەتی، ئەم مەیل و حەزەش بۆ راکـردن لـەوەی هەیـە و عیشق بۆ راکردن و بەرەو ئـەوەی نادیـار و ناپەیدایـە و بالاّیـە و رەهایـە، رۆحـی عاشـیق، دڵەراوکێ و نائارام و پڕ لە دوودڵی و دڵەراوکێی مرۆڤی بالاّ دەهێنێتـەبوون و نـزا واتـە، بـە تەواوی هێزەوە دڵسۆزی، ویستنی ئەوەی لەم دۆخەدا نەمێنمەوە و لـە دۆخێکـی لـەمجۆرە و حـاڵ و دۆخێکی لەم شێوە و ئاستدا نەمێنمەوە، بە تەواوی هێز و تـەواوی توانـا و دڵسـۆزیەوە، ویسـتن و خواستن لە رێڕەوی ئەم تەواوکاری و بالاّبوونەدا بمێنمەوە. چونکە بـە گوتـەی "ئەلیکسـس کـارل": (نزا فڕینی رۆحی مرۆڤە بەرەو ئەو کانونە رۆحانییە مەزن و هێمادارەی گەردوون).

چ کەسێك نزا دەکات؟ نزاکردن، داواکردن و خواستنی ئەوەی دەبێـت بـە توانـا و کـار و ئەندێشە بەدەست دێـت، بـە زۆری نـزا، نییـە. نزاکـردن واتـە خواسـتن و دووبارەکردنـەوەی ویستەکان و نیازەکان، هەروەك دروشمە، هەروەك تەڵقینی بنـەماکانی بیروبـاوەڕە و هـەروەك تازیەباری نزا، زیندووراگرتن لە ویستەکان و ئایدیا پـیرۆزە مرۆییەکانـە، بـۆ ئـەوەی رۆح لـە کۆت و بەندی شتانی دیاری ماددی نزم و رۆژانە و نزمبوونەوە نەمێنێتەوە.

نزا، تەنها ویستنی پێویستی ژیان نییە کە هەیە، بەڵکو نزا، بـالاّبوونی ویسـتنی نیـاز و پێداویستیە بالاّکانی ترە کە بالاّترن لە ژیان.

چ کەسێك نزا دەکات؟ چ کەسێك بە توندی و عیشق و دوودڵی و ترسەوە "دەیـەوێت" و "دەخوازێت"؟ ئەو کەسەی کە لە نێوان "ئەوەی هەیە" لەگەڵ "ئەوەی دەبێت ببێت" تێیـدا زیاد و زۆرە. کەسێکی لەمجۆرە دوودڵە و کەسێکی لـەمجۆرە هەمیشـە خـوازیرا و موشـتاق و نیازمەند و تینووە و کەسێکی لەمجۆرە نزا دەکات. بەڵام ئەو کەسەی ئەم دوو حاڵەتەی لەگەڵ

یەکدا هاوڕا و یەکسانن، یان بە رادەیەك دووری و ماوەی نێوان ئـەم دوو "هـەبووە"ی کەمـە کە بە تێپەڕبوونی پلەیەك و قۆناغێك یان داهاتێکی حیسابی کەم، لەناو دەچێت، ئەوە نـزا و پاڕانەوەی لە هەمان ئاستە کەم و نزمەدایە و دەزگای بوونەوەران و گـوێگری مرۆڤـی نزاکـەر کـە لایـەنگری تـەواوکاری نزاکـەرێکی بالاَیـە لـە روانـین و بۆچـوونیدا نیگایـەکی کـراوە و دەروازەیەکی والاَیە یان قەرەبووکردنەوەیەکی لاواز و تەمبـەڵی مرۆڤـە لـە کاتێکـدا کـە بـۆ رۆحی گەورە و تینوو و عاشیق، نزا میعراجە بەرەو رووی ئەبەدییەت، فـڕین بـەرەو لوتکـەی رەها "مگلق" و بەرزبوونەوەیە بەرەو ئەودیو ئەوەی هەیە.

بە داخەوە لەبارەی نزای ئیسلامییەوە کات و فرسەتی ئەوەم نییـە قسـە بکـەم، چـونکە کات تێپەڕیوە، بەڵکو تەنها بە خستەڕووی میتۆدێك دەوەستم تـاکو لـە دانیشـتنەکەدا گـەر کەسانێك هەبن ئەو ئارەزووەی من هەمە و نەمتوانی بیخەمـە کـار و بیکەمـە کـردار، بـەم میتۆدە شایستەتر لە من بیکەنە کردار و ئەویش کارێکی زانستی و بە میتـۆدێکی زانسـتیە لەسەر رووی دەقەکانی نزای ئیسلامی. نزا ئیسلامییەکان لە ووشـەیەکدا، نـزا و دوعـا نـین، بەڵکو دەقی خوێندنەوە و فێرکاری فەلسەفی و بیروباوەڕیە لە شێوەی قسەکردن لەگەڵ خودا و بە شێوەی راگەیاندنی نیاز و پێداویستیەکان لە خواسـتی مرۆڤـەکان. جۆرێـك جیهانناسـی، خوداناسی و مرۆڤناسی قوڵ و ناسك و جوان و کاریگەربەخشن. چەند نموونەیـەکم "سـەحیفە سەجادیە" هێنابوو بۆ ئەوەی لێرەدا بیانخوێنمەوە، بەڵام ماوە و کات نییە.

لە بنەڕەتدا نزا ئیسلامییەکان خاوەنی دوو بەشن:

یەکەم: قسەکردن و وتەیە لەگەڵ خودای گەورە. لەم قسەکردنەدا کە خوازیار یـان نزاکـەر لەگەڵ خودادا قسە دەکات، سیفەتەکانی خودا و پلەی خودا، زاتـی خـودا، پەیوەنـدی خـودا لەگەڵ بوونەوەراندا، پەیوەنـدی خـودا لەگـەڵ لەگـەڵ مـرۆڤ، پەیوەنـدی تـاك لەگـەڵ خـودا، چۆنییەتی بەڕێوەبردن و ئیـدارە و مـەزنی و سـیفاتی مـەزنی خـودا، لـە زمـانی نزاکـەرەوە دەردەبڕدرێن بـە جۆرێـك ئەگـەر ووتـەکان لابـەرین، دەبێتـە کتێبێکـی فەلسـەفی لـەبارەی خوداناسیەوە. لەوێ نزا بوونی نییە، کەسێك شتێك لـە خـودا ناخوازێـت، لـەوێ قسـەکردنە

لەگەڵ خودا، ئەم گوتە و قسانە هێندە جوانن، قوڵ و ووردن کە جوانترین و ووردترین و ناسکترین و لە هەمانکاتدا قوڵترین سیفەتەکان و بەڵگەکان و سەلماندی خوداناسی لە لایەن مرۆڤەوە دەردەبڕدرێت.

دووەم: قۆناغی بچوکیەتی، ئەویش بریتیە لە ویستن و خواستن. ئەم ویستنانە، داواکاری پێویستی ماددی بەو جۆرەی لە نێو ئێمەدا هەن، نین. بەڵکو خواستنی خوە پەسەند و فەزیلەتە مرۆییەکانن لە ئەو. ئەوەی دووبارە دەبێتەوە، ڕاگەیاندنی ئەو شتانەیە کە هۆکاری بەختەوەری بۆ من و خێزانی من و کۆمەڵگەکەی منن. داواکردن و خواستنی خۆشبەختی و بەختەوەری و عەدالەتە بۆ کۆمەڵگەیە. دووری لە نزمی و پەستیەکان، زەلیلیەکان، پێویستبوون بە ئەوانیتر، قبوڵکردنی ستەم و سازشکردنە لەگەڵ ستەمە، ڕزگاربوون لە داڕوخان و بابەتگەلی لاوازی مرۆییە. هەموو ئەمانە، ئەگەر شێوەی نزای لێ لابەرین، جارێکی دی دەستور و ڕێسای ئەخلاق، یاسا و ڕێسای ژیانی کۆمەڵایەتی و هەروەها ئاگایی دان بە مرۆڤە، کە لاوازییەکان و زەلیلیەکان چین؟ ئاگایی بەخشینە بە مرۆڤە کە سەرمایەی ڕاستەقینە و خواستنە سەرووترەکان و هۆکارەکانی کەوتنی مرۆیی کامانەن؟

لە کۆتایی کتێبی "نزا"دا دەمویست پاش ئەوەی وەرمگێڕا، لێکۆڵینەوە لەسەر نزا ئیسلامییەکان بکەم، بەڵام کات ڕێگەی نەدا و بەداخەوە نەمتوانی. بەڵام لە ئەورووپا لەگەڵ وەرگێڕانی "نزا"ی "ئەلیکسس کارل" لەو لێکۆڵینەوە رووکەشیەی لەسەر نزا ئیسلامییەکان ئەنجامدا، ئەو توخمانەم دۆزیەوە نزای ئیسلامی دروست دەکەن، ئەوانیش:

یەکەم: ڕەوانبێژی و لایەنی پاراوی زمانە. دەقی نزا ئیسلامییەکان لە جوانترین دەقە ئەدەبی و هونەری و باڵاترین پەخشان لە زمان و نموونەی باشترین بەکارهێنانی ڕەوانی و ڕەوانبێژی و پاراوین لە دەربڕیندا و ئەمەش ئەوە پیشاندەدات کە ئیسلام نەك تەنها گرنگی بە جوانی و بە بەهای هونەر — بەو مەرجەی لە خزمەت تەواوکار "تکامل"ی ڕۆحی مرۆیدا بێت- دەدات، بەڵکو بە شێوەیەکی فراوان فەرمانی دڵنیاکەرەوە بۆ گرنگیدان و پەیوستبوونە بە جوانی و هونەرەوە.

دووەم: مۆسیقای ووتە، ووشە، رستە و هەموو دەقەکە. هەموو نزایەك سێ مۆسیقای لـە یەکتر جیای هەیە: مۆسیقای ووشە، ووشـەکان لـەرووی پێکهاتـە و بەشـەکانییەوە، لـەرووی "سەجع"ەوە هاوئاهەنگیان لەگەڵ یـەکتردا هەیـە و هـەروەها هـەر ووشـەیەك لـەرووی ئـەو پیتانەی پێکی دەهێنێت "دەنگەکان" خاوەنی مۆسیقای حیسابکراوە.

هەروەها رستە خاوەنی ئاهـەنگێکی دەسـتەواژەییە و لەگـەڵ ئەوەشـدا هـەموو دەقەکـە چەماوەی دەنگێکی تایبەت و تـۆنی تایبـەت و سـەرو ژێرێکـی خـۆش ئاهـەنگ و گـۆڕانی دەنگێکی گونجاو و مانادار و هاوئاهەنگ لەگـەڵ کرۆکـی نـزا. کاریگـەری ئـەم ئاهەنگـە و کاریگەری جوانییەکانی وتە، لە رۆحی مرۆڤدا بە جۆرێکە کە یارمەتی رۆح دەدات بۆ چـوون بۆ پەنای عیشق و لەبەرامبـەردا ئامـادەگی لەبـەردەم خـودادا و زۆرتربـوونی کاریگـەربوون لەبەرامبەر نزادا.

سێیەم: توخمی فیکری لە نزا ئیسلامییەکاندا بوونی هەیە. توخمی فیکری واتە ئەوەی کـە هەموو دەقە ئیسلامییەکان لە سەرەتاوە تاکو کۆتایی "نموونەی تەواوی سەحیفە سـەجادیە"، لەبارەی خوداناسی، مرۆڤناسی، بنـەما ئەخلاقییـەکان و بنـەما کۆمەڵایەتییـەکان و مـافی تاکەکان لەمەڕ یەکتر و چین و توێژەکان لە بەرامبەر یەکتر و روونکردنەوەی ئایـدیا مرۆیـی و هەروەها دەربڕینی ترس و راکردن لە مەترسـییەکان و نزمـی و پەسـتیە کۆمەڵایەتییـەکان و تاکەکەسیەکان و ئەخلاقییەکاندایە.

ئەمە جۆرێك ویستنە، تەنها داواکردن و خواستنی شتێك نییە لە کەسێك. ویسـتن واتـە، راگەیاندنی نیازمەندبوونی من و هەروەها داواکـردن و خواسـتنی شـتە خوازراوەکـانی مـن، راگەیاندنی دروشمەکانی منە، راگەیاندنی نیاز و مەبەستەکانی منە، راگەیاندنی جۆری مـن، کەسایەتی من، پەیمان و بەڵێندانەکانی من و مانای ژیانە لە بۆچوون و روانینـی منـدا. ئـەم لایەنەی تری نزا رەنگە بەهای لەرووی تەواوکار "تکامل"ی و پەروەردەیی لە لایـەنی یەکـەم کە بەدیهاتنی پێویستیەکانە، کەمتر نییە.

چوارەم: توخمی سیاسی و کۆمەڵایەتی لە نزا ئیسلامییەکان و زیاتر لە نزاکـانی شـیعە و تاکو رادەیەك بە شێوەیەکی سنووردار لە نزاکانی شیعەدا.

# نـــزا (١)

**خودایا:**

بیروباوەڕ"عەقیدەم" لە دەستی گریٚ"عقدە"م بپاریٚزە.

**خودایا:**

توانای بەرگەگرتنی بیروباوەڕی "دژەکەم" پیٚ ببەخشە.

**خودایا:**

گەشەی عەقڵی و کرداریم، لە فەزیلەتی دەمارگیری، هەست، ئیشـراق مـەحرووم نەکات.

**خودایا:**

هەمیشە، ئاگا و هۆشیارم کەرەوە، تـاکو پـیٚش ناسـینی "دروسـت و تـەواو"ی کەسیٚك یان فیکریٚك بڕیاری –ئەریٚنی یان نەریٚنی- نەدەم.

**خودایا:**

نەزانی تیٚکەڵ بە خۆویستی و حەسوودی، من بەلاش، ئامرازی کوشتنی دوژمـن بۆ هیٚرشکردن سەر دۆست، دروست نەکات.

**خودایا:**

ناوبانگ، منیٚك کە: "دەمەویٚت ببم"، قوربانی منیٚك کـە: "دەیانـەویٚت بـبن"، نەکات.

**خودایا:**

لـه رۆحمـدا، جیـاوازی لـه "مرۆڤبـوون"، لەگـەڵ لـه "فیکـر" و جیـاوازی لـه "پەیوەندی"، تێکەڵ بە یەك مەکە. بە جۆرێك نەتوانم ئەم سێ پایە جیا لە یەك بناسم.

**خودایا:**

خۆویستی هێندە لەناومدا دەربهێنە، یـان هێنـدە دەری بێنـە تـاکو هەسـت بـە خۆویستی ئەوانیتر نەکەم و تیایدا لە ئازاردا نەبم.

**خودایا:**

لە ئیماندا، "گوێڕایەڵی رەها"م پێ ببەخشـە، تـاکو لـە جیهانـدا، "سەرکەشـی رەها"دا بم.

**خودایا:**

دژی پارێزگاری "تەقوا"م فێر بکە، تاکو لە غەمی بەرپرسیاریەتی نەخلیسکێم و لە پارێزگاری "تەقوا" خۆپاراستن بم پارێزە، تاکو لە خەڵوەتی دابڕاندا تووشی گەنین نەبم.

**خودایا:**

بەرەو نزمی ئـارامی و خۆشـبەختی رام مەکێشـە، دوودڵیـە گـەورەکان، غەمـە بەرێزەکان و حیرەتە مەزنەکان بە رۆحم ببەخشە. چێژەکان بـە بەنـدە هیچـەکانت ببەخشـە و دەرد و ئازارە مەزنەکان بڕێژە گیانمەوە.

**خودایا:**

ئەندێشە و هەست مەهێنەرە ئاستێکی نزمـەوە کـە سـەرنج لـە زرنگـی پـوچ و سووك و پەستی و نزمی نەگبەت و پیس "شێوە مرۆڤە کەمەکان" بدەم، چـونکە حەزدەکـەم "گەورەیەکی گۆڵێکراو"بم تاکو وەك ئەمانە "بچوکی گۆڵکەر".

**خودایا:**

من لە چوار زیندانی گەورەی مرۆڤ: سروشت، مێژوو، کۆمەڵگە و خود، رزگار بکە تاکو بەو جۆرەی کە تۆ ەی بەدیهێنەرم، منت دروستکردوە- خۆم دروستکەری خۆم بم، نەك —وەك ئاژەڵ- خۆم لەگەڵ ژینگە و ژینگە لەگەڵ خۆم هاوڕاو بگونجێنم.

**خودایا:**

ئاگری پیرۆز "گومان" بە جۆرێك لەناومدا داگیرسێنە تاکو هەموو ئەو یەقینانەی لە مندا بوونیان هەیە، بسوتێن و پاشان لە پاشماوەی ئەم خۆڵەمێشە، زەردەخەنەی میهر لەسەر لێوەکانی دەمەوبەیانی یەقینێکی شۆراوە لە هەر غوبار و تۆزێك، هەڵبێت.

**خودایا:**

لە هەژاری وەرگێڕان و زەبونی تەقلید رزگارم بکە تاکو قاڵبە بۆماوەییەکان بشکێنم، تاکو لەبەرامبەر "قاڵبڕێژی رۆژئاوا"دا بوەستم و تاکو -وەکو ئەمانە و ئەوانە- ئەوانیتر قسە نەکەن و من تەنها زارم بجوڵێنم!

**خودایا:**

قەناعەت، خۆراگری و ئارامگری لە نەتەوەکەم وەربگرەوە و بەمنی ببەخشە.

**خودایا:**

لە نەگبەتی دۆستییەکان و دوژمنییەکانی رۆحە سووك و هیچەکان، لە پەنا رۆحە شکۆکانی وەکو "عەلی" و دڵە جوانەکانی هەموو سەدەکان —لە گەلگامێشەوە تاکو "سارتەر" و لە "لوپی" تاکو "عین القچاه" لە "عین القچاه" و لە "مهراوە" تاکو "رزاس" پاك بکەرەوە.

**خودایا:**

هەروەك منداڵی گەورەی "حسێنی کوڕی عەلی" سوپاست دەکەم کە دوژمنانم لە نێو ئەحمەقەکاندا هەڵبژێریت، چونکە چەند دوژمنێك شێت بەخششێکە کە خودا تەنها بە بەندە تایبەتەکانی پێشکەش دەکات.

**خودایا:**

هەرگیز مەمکە بە مورادی بێ هەستەکان و خۆشەویستیە سوێرەکانی میوە.

**خودایا:**

ئیرادە، زانست، سەرکەشی، بێ نیازی، حیرەت، ناسکی و میهرەبانی رۆح، شەهامەت و تەنیایم زیاد بکە.

**خودایا:**

یارمەتیم بدە تاکو کۆمەڵگەکەم لەسەر سێ پایەی کتێب، تەرازوو، ئاسن بەهێز بکەم و دڵم لە سێ سەرچاوەی حەقیقەت، جوانی، خێر، تێر بکە.

**خودایا:**

ئەو کەلامەی پیرۆزەی بە "رۆسۆ"ت بەخشیوە، هەرگیز لەبیرم مەبەرەوە کە: مـن دوژمنی تۆ و بیروباوەڕی تۆم، بەڵام ئامادەم گیانم بۆ ئازادی تۆ و بیروباوەڕی تۆ فیدا بکەم!

**خودایا:**

کۆمەڵگەکەم لە بیماری تەسەووف و مەعنەویەت بوون شیفا بدە، تاکو بۆ ژیان و واقیعییەت بگەڕێتەوە و من لە رۆچوونی ژیان و نەخۆشی واقیعییەت زەدەیی رزگار بکە تاکو بە ئازادی عیرفانی و کەمالی مەعنەوی بگەم.

**خودایا:**

ئەو رۆشنبیرانەی کە "ئابووری" بە بنەڕەت دەزانن، فێریان بکە کە "ئابووری" ئامانج نییە.

وە بەو مەزهەبیانەی کە کەمال و تەواوکاری بە ئامانج دەزانن، فێریان بکە کە "ئابووری"یش بنەڕەتە.

**خودایا:**

ئەم ئایەتەی خستوتە سەر زمانی "دیستۆفیسکی" بخەرە سەر دڵی رۆشنبیران کە "ئەگەر خودا نەبێت، هەموو شتێك رێگە پێدراوە"، جیهان ونبووی مانا و ژیان ونبوی ئامانج و مرۆڤ پوچە و ئەو مرۆڤەش کە مانای نییە و مانای ونکردوە، بەرپرسیاریەتیشی ونکردوە.

**خودایا:**

هەرکەسێکت خۆش دەوێ فێری بکە کە: عیشق لە ژیانکردن باشترە و هەرکەسێکت خۆشتر دەوێ پێ بچەژە کە: خۆشویستن لە عیشق سەرووترە!

**خودایا:**

سەرکەوتن لە هەوڵدان، لە شکستدا، سەبر و ئارامگری لە نائومێدیدا، رۆیشتنی بێ هاوڕا و هاوڕێ، جیهادی بێ چەك، کاری بێ پاداشت، فیداکاری لە سکوت و بێدەنگیدا، ئایینی بێ دونیا، مەزهەبی بێ نەزان و نەخوێندەوار، مەزنی بێ ناو، خزمەتی بێ نان، ئیمانی بێ ریا، چاکی بێ دەرکەوتن، دلفراوانی بێ کرچ و کاڵی، رێگری بێ غرور و سەرکەشی، عیشقی بێ هەوەس و ئارەزوو، تەنیایی لە ناو کۆمەڵگەدا، خۆشویستن بێ ئەوەی دۆست بزانێت، ببەخشە.

**خودایا:**

لەو هەموو فەزیلەتانەی بە کەڵکی خەڵکی نایەن، بێبەش بکە!

**خودایا:**

گۆشەگیرانی مەزن کـە لـە گۆشـەی ریـازەت و گۆشـەگیری و کـەرناگیری پـاکی پەرستش، یان زانست یـان هونـەر، دەسـتیان بـە کوشـتنی نـەفس کـردوە، هەرچـی زووتـر سەرکەوتنیان پێ ببەخشە! تاکو لەم سروشتەی چاکەی خودادا، کە هەر بوونـەوەرێك — جگـە لەمانە — مانایەکی هەیە، وە لەم ئەندامی زیندووی جیهانەدا، هەر گەردیلەیـەك خانـەیی و لەم سیستەمی هاوئاهەنگی بەدیهێنراوە، هەر دروستکراوێك رۆڵێکـی هەیـە، جێگەیـەك بـۆ وورده زیندەوەرێك — کە دەزانێت بۆچی دەژی — تـەنگ و تەسـك نـەبێت و دروسـتبوون لـە بێهودەیی و پوچی پاك بێتەوە و لە چاوی رووکەش بینی پیری حافز، هەڵەیەك بەسەر قەڵەمی دروستکراودا نەیەت.

**خودایا:**

بە "سارتەر" بڵێ کە ئەگەر پێوەری خێر و چاکەش خـودی خـۆم — بـەو جۆرەی کە دەمەوێت — دروست دەکەم، کەواتە نییەت و نیاز خێر — کە ئەو دەیکاتە پێوەری ئەخلاق — چییە؟

**خودایا:**

بە ماددیگەراکان بڵێ مرۆ درەختێك نییـە ناخودئاگـا، لـە سروشـت، مێـژوو و کۆمەڵگەدا بڕوێت.

**خودایا:**

کۆمەڵگەکەم فێرکە کە تەنها رێگەیەك بەرەو لای تۆ، لـە زەویـەوە تێدەپـەڕێت، بەڵام رێگەیەکم پیشان بدە لە نیوەوە دەست پێ بکات.

**خودایا:**

مەزهەبیەکان تێ بگەێنە کە مرۆڤ لە خاکە، بڵێ کە: دیاردەیـەکی مـاددیش بـە هەمان ئەو ئەندازەیە مانای خودا دەکات کە دیاردەیەکی غەیبی دەیکـات، لـە دونیـادا بـە هەمان ئەندازە خودا بوونی هەیە کە لە دوارۆژدا هەیە.

وە مەزهەب، ئەگەر پێش مەرگ بەکارنەیەت و سوودی نەبێت، کەواتە پاش مەرگ بەکەڵکی هیچ کارێك نایەت.

**خودایا:**

کافر کێیە؟ موسوڵمان کێیە؟ شیعە کێیە؟ سوونە کێیە؟ سنوورە راست و دروستەکانی هەر کامیان کامانەن؟

**خودایا:**

پێم بڵێ، تۆ خۆت چۆن دەبینی؟ چۆن بڕیار دەدەیت؟ ئایا خۆشویستن و دەربڕینی عیشق بۆ ناوەکان شیعەگەرییە؟ یان ناسینی ناولێنراوەکان؟

**خودایا:**

ژیانێکم پێ ببەخشە کە لە ساتی مەرگدا، حەسرەت و ئاخ بۆ بێ بەرهەمی ساتێك نەخۆم کە بۆ ژیان تێپەڕیوە و مردنێکیشم پێ ببەخشە کە بۆ بێهودەبوونی، تایەزبار نەبم.

بهێڵە تاکو خۆم هەڵی بژێرم، بەڵام ئەوەی کە تۆ خۆشت دەوێت.

**خودایا:**

چۆنییەتی ژیانم فێر بکە،
خۆم چۆنییەتی مردن فێر دەبم.

**خودایا:**

لەم مەترسییە پیسەی بەرژەوەندی پەرستی - کە چونکە هەموو کەسی گرتۆتەوە و پیسیەکەی لەبیر چۆتەوە و بۆتە نەۆخشی و بیمارییەك کە لە رۆچوونی گشتیدا، هەر کەسێك بەسەلامەتی لێی دەرچوو بێت، بیمار و نەخۆش دەردەکەوێت- بپارێزە، تاکو بە رەچاوکردنی بەرژەوەندی، حەقیقەت نەکەمە قوربانی شەرعی.

**خودایا:**

مەهێڵە

کە: ئیمانم بە ئیسلام و عیشقم بۆ خانەوادەی پێغەمبەر "ص"، بە بەدەستهێنانی ئایین، بە هێرشی دەمارگیرنە و کرداری دواکەوتوانە، هاوئاواز بکات.

کە: ئازادیم بکاتە ئەسیری پەسەندکراوی نەزان.

کە: ئایینم لە پشت روخساری ئایینیم دەفن ببێت،

کە: نەزانی و عەوام زەدەییم بکاتە چاولێگەری چاولێکەرەکانم،

کە: ئەوەی بە حەق دەزانم، لەبەرخاتری ئەوەی بە خراپ دەیزانن، بشارمەوە!

**خودایا:**

دەزانم کە ئیسلامی پێغەمبەرەکەت بە نا دەستی پێکرد و شیعەگەری دۆستی تۆش بە نا دەستی پێکرد.

من، ئەی نێرەری (موحەممەد)"ص" و ئەی خۆشەویستی "عەلی"!

بە ئیسلامی بەڵێ و بە شیعەگەری بەڵێ، کافر بکە!

**خودایا:**

رەحمم پێ بکە تاك ئیمان ناو و نانم بۆ نەهێنێت، هێزم پێ ببەخشە تاکو نانم و تەنانەت ناوم بخەمە مەترسی ئیمانمەوە، تاکو لەوانە بم پارەی دونیا وەردەگرن و بۆ ئایین کار دەکەن، نەك ئەوانەی پارەی ئایین وەردەگرن و بۆ دونیا کار دەکەن.

**خودایا:**

هەمیشە سوپاست دەکەم کە هەرچی زیاتر لە رێگەی تۆ و لە پەیامەکەی تۆدا بەرەو پێشەوە دەڕۆم و زیاتر رەنج و ئازار دەبەم، ئەوانەی دەبێت نازم بکێشن، لێم دەدەن. ئەوانەی کە دەبێت هاوهەنگاوم بن، رێگری رێگەم دەبن. ئەوانەی دەبێت حەقناسی بکەن، حەق کوشتن ئەنجام دەدەن، ئەوانەی دەبێت دەستم بگوشن، زللەم لێدەدەن. ئەوانەی کە دەبێت

لەبەردەم دوژمندا بەرگری بکەن، پێش دوژمن هێرش دەبەن و ئەوانەی دەبێت لەبەرامبەر کشانەوەی بێگانە و لێدانیان ستایشم بکەن، بەهێزم بکەن، ئومێدەوارم بکەن و لێم نزیك ببنەوە، سەرزەنشتم دەکەن، لاوازم دەکەن، نائومێدم دەکەن، تاوانبارم دەکەن، تاکو — لە ڕێگەی تۆدا- لە تەنها پێگەیەك کە چاوێکی هاوکارم هەیە و پاداشتێك، نائومێد ببم، چاوم ببەستم، لێبخورم... تاکو تەنها ئومێدی تۆ بێت، چاوی چاوەڕوانم تەنها بەرووی تۆوە بکرێتەوە، تەنها داوای یارمەتی لە تۆ بکەم، پاداش تەنها لە تۆوە وەربگرم، لەو حیسابەی لەگەڵ تۆ هەمە، هاوەڵێکی دیکەی نەبێت، تاکو:

ئەرکم لەگەڵ تۆدا ڕۆشن و ڕووناك ببێتەوە، تاکو ئەرکم لەگەڵ خۆمدا دیار و زانراو بێت، تاکو شیرینی دڵسۆزی — کە هەر دڵێك کەمێکی لێ چەشت، هیچ شکرێك لە تامیدا شیرین نییە- بچەژم.

**خودایا:**

دڵسۆزی و نییەت پاکی! دڵسۆزی و نییەت پاکی!

وە دەزانم خودا، ئەی خودا، دەزانم بۆ عیشق، ژیانکردن، بۆ جوانی و خێر، ڕەهابوون چۆن مرۆڤ بەرەو ڕەها دەبات، چۆن دڵسۆزی و نییەت پاکی، ئەم بوونە ڕێژەییە، ئەم بوونەوەرە هیچە کە بریتیە لە کۆمەڵێك لە پێداویستیەکان و لاوازییەکان و چاوەڕوانییەکان، ڕەها دەکات!

لە بەرامبەر بێشوماری ڕاکێشانەکان و بانگەشەکان و زیانەکان و مەترسییەکان و ترسەکان و وەسوەسەکان و پەیوەستبوونەکان و شادیەکان و غەمەکانی هەمووان سووك و پوچ کە دەوروبەری بوونیانیان داگیرکردوین و جاروبار بەخۆیانمانەوە دەلەرزێنن و هەروەك غەمێك لە گورگەکان و ڕێوییەکان و قەلەرەشەکان و کرمەکان، بەسەر مرداری بوونی ئێمەدا ڕژێنراون،

لەگەڵ خۆویستیەکی مەزنی شۆڕشگێڕانە، - کە پەرجووی زیکرە، زادەی کەشفکردنی بەندایەتی خۆبەکەمزانانە خودگەری خودایی مرۆڤە — لەناکاو سەرکەشی دەکات، -

سەرکەشیەك کە بە هەڵبژاردنی تەسلیمی رەها بە حەقیقەتی رەها دەگات و لە قوڵایی فیترەتەوە بڵێسەی دەکات- و پاشان بە تیغی بودا ئاسای بێ نیازی و بێ پەیوەندی و تەنیایی، تاك دەبێتەوە و پاشان،

لە بودا سەرووتر دەڕوات و بە پرسەی نەبوون و نەویستن، هەموو ئەو گیانەوەرە مرۆڤخۆرە لە دەوروبەری مرۆڤبوونی خۆیدا، راو دەنێت و پاشان،

ئازاد، سوکبار، شۆرا و پاك، پاك و خواناس، بۆتە خۆی و تاك و رزگار بوو، بۆتە مرۆڤ و بێ نیاز،

بەرەو بەرزترین لوتکەی باڵای میعراجی تەنیای دەگات و لەوێ هەموو من درۆزن و ناشیرینەکان — گۆڕێکن لەسەر جەنازەی شەهیدی ئەو من راستەقینە و جوان و چاکە کە هەمیشە تیایدا نێژراوە و لە چاوی خۆی نەزانرا و نادیار و لە یادی خۆیشی فەرامۆش — دەڕژێت،

بە زیکر و یادکردنەوە، بە جیهادی گەورە و بە مردنی پێش مەرگ.

لە دەروونەوە، دەست بە کۆچ دەکات. هیجرەت و کۆچ لەوەی کە هەیە، بەرەو ئەوەی کە دەبێت ببێت،

تاکو...

بە دڵسۆزی و نییەت پاکی دەگات و بوونی مرۆڤ، بە دڵسۆزبوون و نییەت پاکی!

دڵسۆزبوون بۆ ئەو، بەرەو رووی ئەو،

وە چەند چاك دۆزیویەتیەوە راڤەکەری قورئان و لە ووشە تێگەیشتوو و ووشەناسی فارسی، هەزار ساڵ پێش ئێستا:

اخلاص: یەکتایی (نوسخەی دەستنووسی کۆنی قودسی مەشهەد، رەنگە هاوچەرخی "تەبەری" بێ، لە سەدەی چوارەمدا).

بەڵێ، یەك تۆیی!

ئەو کاتە، بەندەیەکی لەمجۆرەی خاشع — کە بە بەندایەتی، خوداجۆر بووە لەسەر زەویدا،

وە ئەمە ئەم جۆرە دۆستە خاکیە — کە لە خۆشویستن، بۆتە خودایی، چونکە خۆشویستن، ئەگەر بە دڵسۆزی گەیشتبێت، دۆست وەکو دۆست لێدەکات- لە ژیان زیندووترە و لە خۆشبەختی جدیتر!

نیاز، ترس، حەق ناسی، حەق کوشتن، مەترسی، ئاسایش، سود و زیان، دوژمنییەکان و دۆستییەکان، نەفرینەکان و ئافەرینەکان، شکستەکان و سەرکەوتنەکان، شادیەکان و غەمەکان ... کە گورگەکان و قەلەرەش گەلێك بوون، وەحشی و مرۆڤخۆر- ئێستا، بونەتە وورده زیندەوەر و مێروو، یاریچی سوك و هیچی پیاو!

وە پیاو، جەزیرەیەك لە خۆیدا،
لە زەریای بووندا،
تەنیا و بە خودی خۆی،
هەرێمێك لە چوار لاوە، سنوردار بە خۆی،
بێ مەترسی شەپۆل، بێ نیازی کەنار،
نیلوفەرێك رواوە لە قوڕی شێلراو و سەردەرهاتوو لە ئاو، بەڵام بێ پاشماوە و پیسی ئاو،
شکۆفە و والآ لە ژێر بریسکانەوەی خۆردا، لەبەرخۆردا!

وە ئێستا، ئەوە دەتوانێت بژی، تەنها بە تامی بیروباوەڕ و شەرابی جیهاد، وە بمرێت، شەهیدئاسا، بەهەمان ئەو جوانی و دروستی و ئازادی، کە ژیان دەکات.

ئازادی:
یەکتایی لە ژیانکردن،
یەکتایی لە بوون،
یەکتایی لە عیشق.

# نـــزا ( ٢ )

**ئەی خودایا:**

تۆ کە رێزت لە "بنی ئادەم" گرتوە،

تۆ کە ئەمانەتی تایبەتی خۆت خستۆتە سەرشانی مرۆڤ،

تۆ کە هەموو پێغەمبەرانت بۆ فێرکردنی کتێب و هێنانەدی عەدالەت ناردوە.

تۆ کە عیززەت هی خۆتە و بەهی خۆتی دەزانی و هەروەها بەهی پێغەمبەرانی خۆت و ئەو مرۆڤانەی ئیمانیان هەیە...

ئێمە مرۆڤین،

ئیمانمان بە تۆ و پەیامی پێغەمبەرانت هەیە

ئازادی و ئاگایی و عەدالەت و عیززەت لە تۆ دەخوازین و داوای دەکەین.

ببورە، کە زۆر پێویستیمان هەیە، ئازاراویتر لە هەموو کاتێك، قوربانی کۆت و بەندی و نەزانی و زیللەتین.

ئەی خودای لاوازان:

تۆ کە (تۆ کە ئیرادەت کرد تاکو منەت بخەیتە سەر بێچارەکانی سەرزەوی و توێژە مەحکومەکانی لاوازی و بێبەش لە ژیان — کە کۆت و بەندانی مێژوو و قوربانیانی ستەم و خیانەتی سەردەم و خەشم لێگیراوانی دۆزەخی زەوین — بیانکەیتە رێبەری مرۆڤەکان و بیانکەیتە خاوەنی جیهان)

ئێستا کات گەیشتوە و لاوازانی زەوی چاوەڕوانی بەڵێنی تۆن،

ئەی دەرکەوتەی غیرەت،

لاوازانی زەوی، لەم سەردەمەدا تەنها تۆ دەپەرستن.

**ئەی خودایا:**

تۆ کە هەموو فریشتەکانت خستەبەردەم پێیەکانی ئادەم بۆ ئەوەی کڕنوش بەرن، ئێستا دەبینی کە بەنی ئادەم لە بەردەم پێی دیوان و بەردەرگایاندا دەستیان بە کڕنوش کردوە؟

ئەوانە لە کۆت و بەندی پەرستشی بتەکانی ئەم سەدەیە — کە خۆمان تاشیومانن — بەرەو بەندایەتی ئازادی بەخشی پەرسشتی خۆت، ئازادی ببەخشە!

**ئەی خودایا:**

(ئەوانەی بەرامبەر ئایەتەکانی تۆ کوفر دەکەن، پێغەمبەرانی تۆ بەناحەق دەکوژن و هەروەها ئەو پیاوانەی لە ناو خەڵکەوە هاتوونەتە دەرەوە و داوای عەدالەت و یەکسانی دەکەن، لەناو دەبەن.) هێشتا بەسەر جیهاندا زاڵن. ئەو سزایەی موژدەت پێدابوو، بۆیان بنێرە!

**ئەی خودایا:**

بەرپەرسیاریەتی بە زانایانمان، زانست بە نەزانانمان، رووناکی بە ئیماندارانمان، ئیمان بە رۆشنبیرانمان، تێگەیشتن بە دەمارگیرانمان، دەمارگیری بە تێگەیشتوانمان، هەست بە ژنانمان، شەرەف بە پیاوانمان، ئاگایی بە پیرانمان، رەسەنێتی بە لاوانمان، بیروباوەڕ بە مامۆستایانمان، هەروەها بیروباوەڕ بە فێرخوازانمان و بێداری بە خەوتوانمان، ئیرادە بە بێدارانمان، حەقیقەت بە بانگخوازانمان، ئایین بە ئایینداراغان، بەڵێن بە نوسەرانمان، دەرد و ئازار بە هونەرمەندانمان، هەست بە شاعیرانمان، ئامانج بە لێکۆڵەرەوانمان، ئومێد بە نائومێدانمان، هێز بە لاوازانمان، فراوانی و دڵگوشادی بە پارێزگارانمان، هەستان بە دانیشتوانمان، تەکان و جووڵە بە وەستاوانمان، ژیان بە مردوانمان، نیگا و بینین بە نابینایانمان، فریاد بە خامۆشانمان، قورئان بە موسوڵمانانمان، عەلی بە شیعەکانمان، یەکتایی بە گروپ و کۆمەڵە جیاوازەکانمان، شیفا بە حەسودانمان، ویژدان بە خۆبینانمان، ئەدەب بە خراپەکارانمان، سەبر و ئارامگری بە تێکۆشەرانمان، خودئاگایی بە خەڵکانمان و بە هەموو نەتەوەکەمان، هیممەتی بڕیار و ئامادەگی فیداکاری و شایستەیی رزگاری و عیززەت ببەخشە.

**سوپاس بۆ خودا شەوی یەڵدا لە وەرگێڕانی تەواو بووم.**

**٢٠\٢١-١٢-٢٠١٣ – سلێمانی**

# بەرهەمەکانی وەرگێڕ:

## چاپکراوەکان:

١. دیوی ئەخلاقی ڕێکخراوە مەدەنیەکان. ئامادەکردن، ساڵی ٢٠٠٧.
٢. ئێمە لەکام جیهاندا دەژین؟ ن: د. عبدالکریم سروش. وەرگێران، ساڵی ٢٠٠٧.
٣. دەفتەرە خۆڵەمێشیەکان. د. علی شریعتی، وەرگێران، چاپی دووەم، ٢٠٠٨.
٤. عیشق گەورەتر لە عیشق! نوسین، چاپی دووەم، ساڵی ٢٠٠٩.
٥. عەقڵ و ئیمان.ن: د.عبدالکریم سروش. وەرگێران، چاپی دووەم، ساڵی ٢٠٠٩.
٦. شارناسی و ...، تەحسین حەمەغەریب. پێشەکی و ئامادەکردن، ساڵی ٢٠٠٩.
٧. چیەتی مەرگ؟ د.عبدالکریم سروش، ئامادەکردن و وەرگێران، ساڵی ٢٠٠٩.
٨. ئەرستۆ، ن:پ.ستراتیرن، وەرگێڕان، ژیانی فیکری و فەلسەفی، ساڵی٢٠١٠.
٩. نەتەوەناسی..، ن. تەحسین حەمە غەریب، ئامادەکردن. ساڵی ٢٠١٠.
١٠. سوکرات و ئەفلاتۆن، کۆمەڵە ووتە. چاپی دووەم، ساڵی ٢٠١١.
١١. ئایا ئادەم نەیبینی؟ ن. جبران خەلیل جوبران. وەرگێڕان،ساڵی ٢٠١١.
١٢. سوننەت و مۆدێرنە، د.سروش، د.حسێن نەصر، نووسین و وەرگێڕان،٢٠١١.
١٣. بۆچی ترس لە مەرگ؟ ن: مهاتما گاندی. وەرگێران، چاپی دووەم، ٢٠١٢.
١٤. مرۆڤ، ن. د. عەلی شەریعەتی، وەرگێڕان، چاپی دووەم، ساڵی ٢٠١٣.
١٥. ووتەکانی ژیان، ئامادەکردن و وەرگێڕان، چاپی دووەم، ساڵی ٢٠١٣.
١٦. عەقڵ و عیشق، ن. د.عبدالکریم سروش، وەرگێڕان، ٢٠١٣.
١٧. ئەخلاق و مەعنەوییەت، کۆمەڵە نووسەر، موسعەب ، فاتیمە ئەدهەم، ٢٠١٣.
١٨. وتەکانی عیشق، کۆمەڵە نووسەر، ئامادەکردن و وەرگێڕان، ٢٠١٣.
١٩. ئیسلامی کوردی و.. تەحسین حەمەغەریب، ئامادەکردنی: موسعەب ئەدهەم، ٢٠١٣.
٢٠. موناجاتنامە، خواجە عەبدوڵڵای ئەنساری، ئامادەکردن و وەرگێڕان. ٢٠١٣.
٢١. ئەخلاق و فەزیلەت، ن. د.ئارەش نەراقی، وەرگێڕان. ٢٠١٣.
٢٢. نزا، د. عەلی شەریعەتی، وەرگێڕان، ٢٠١٤.

## ئەو بەرهەمانەی لەبەردەستدان:

١. ئەدەبی قودرەت، ئەدەبی عەدالەت، ن. د.عبدالكريم سروش، وەرگێڕان.
٢. فیکری ناسکی غەمناك، ن.د. سروش دەباغ، ئامادەکردن و وەرگێڕان.
٣. فەلسەفەی عەدالەت. ن: تەحسین حمەغریب، وەرگێڕان.
٤. گەورەتر لە ئایدۆلۆژیا، ن. د.عبدالكريم سروش، وەرگێڕان.
٥. را پۆرتێك بۆ خاكی یۆنان. ن: نیكۆس كازانتزاكیس، وەرگێڕان.
٦. ئایینەكانی چین و یابان. وەرگێڕان.
٧. ووتەکانی سوکرات و ئەفلاتۆن و ئەرستۆ، ئامادەکردن و وەرگێڕان.
٨. فیکر و فەلسەفە، كۆمەڵێك وتاری فیکری و فەلسەفی.

بێجگە لە نوسین و ئامادەکردن و وەرگێڕانی چەندین بابەتی فیکری و فەلسەفی و ئەدەبی و لێکۆڵینەوە و گفتوگۆ لەساڵی (١٩٩٧)ەوە تاکو ئێستا بەبەردەوامی لە زمانەکانی (فارسی و عەرەبی) لە گۆڤارەکانی "هەژان، چاوی هەژان، ئێرانناسی، ئەمریکاناسی، سەردەم، زانستی سەردەم، هەورامان، هێشتا، پەیامی راستی، سۆسیۆلۆژیا، لڤین، رامان، کەوانە، شرام، کۆچ، نووسین، ئایندەسازی، پەنجەرە، روون، سەرچاوە" هەروەها رۆژنامەکانی "خەبات، یەکگرتوو، کوردستان راپۆرت، ئاوێنە، داهێنان، کوردستانی نوێ، ئاسۆ، کۆمەڵ، ئاینده، ئایندەسازی، ژیانەوە، خورماڵ..."